یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
لە کوردستاندا
31
لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا
بڕیار
منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com
مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی سێیەم کانونی یەکەمی ٢٠١٠
قۆپییکردن!
بەڕێوەبەرەکەت
بناسە
براوەکان سزا دەدرێن!
چاوپێکەوتنێک لەگەڵ نەریمان ئەنوەر
داهێنەری یەکەمین فڕۆکەی کوردی
ساڵێکی نوێ و
مرۆڤێکی نوێ

The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی سێیەم - ژمارە 31 - کانونی یەکەمی 2010



حساب بانکی گۆڤار

بانکی کوردستانی نێودەوڵەتی سلێمانی 3371

خاوەنی ئیمتیاز

**ئەندازیار مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی**

سەرنووسەر

**عادل محەمەد شێخانی**

sarnosar@yahoo.com

بۆ دابەشکردنی بڕیار

هەولێر: خانەی سیروان ٠٧٥٠٤٦٧٢٩٦٣

کەرکوك: ٠٧٧٠٨٥٦٣٧٢٤ هەڵەبجە: ٠٧٧٠١٩٣٣٩٦٧ -٠٧٥٠١١٢٩٤٣٧

دەربەندیخان: ٠٧٧٠١٥٨١٠١٨ کفری: ٠٧٧٠١٥٦٦٨٧٦ کەلار: ٠٧٧٠٢١٠١٢٨٨

چەمچەماڵ: ٠٧٧٠٨٥٥٠٥٨٦ کۆیە: ٠٧٥٠١١٥٥٠٣٧ سۆران: ٠٧٥٠٤٥٠١٩٣٣

چۆمان: ٠٧٥٠٤٥٦٧٩٩٢ قەڵادزێ: ٠٧٧٠١٥٨٥٢٠١ ڕانیە: ٠٧٧٠١٥٨٠٤٤٢

ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری سلێمانی مۆڵ- نهۆمی دووەم

بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە

٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢ ٣١٩٣٩٤٦

E-mail: bryarmagazin@gmail.com

هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٢٣٠

چاپخانەی سەردەم

نرخ 2500 دینار

ئەگەر ئامانجێکت نییە لە ژیاندا

با ئامانجی یەکەمت

پەیداکردنی ئامانجێك بێت!

# ساڵێکی نوێو مرۆڤێکی نوێ

زۆربـەی مرۆڤـەکان سـاڵی نـوێ بە ئاهەنـگو پیرۆزبایی‌و دەربڕینی شـادی پێشـوازی لێ دەکەن، بێئەوەی ئاوڕێك لە ڕابـردوو بدەنەوەو بەرنامەیەکیشـیان بۆ ئاینده دانابێت.

بـەم کارەش چاوەڕوانی هیچ شـتێکی نوێ لە سـاڵی نوێ ناکـەن‌و ژیانیان وەکو فیلمێکی کۆن، دووبارە دەبێتەوە.

سـاڵێك تەمەن کە زێتـر (٣٦٠) ڕۆژەو زێتـر لـە (٨٥٠٠) کاتژمێـرو (٠٠٠ ٥٠٠) نیوملیۆن چرکە پێك دێت.

مرۆڤـە هۆشـیارەکان ڕێگەنـادەن بە سانایی بەسەریاندا تێپەڕ ببێت، بێئەوەی سـود لـە هەمـوو چرکەکانـی ژیانیـان وەرنەگرن.

بۆ ئەوان سەری ساڵی نوێ وێستگەیەکی هێمنـە بۆ پێداچوونەوەی سـاڵی ڕابردوو بـە وردی لـە ڕابـردوو ڕادەمێنـن‌و بـۆ خاڵـە لاوازەکان چارەسـەر دیاری دەکەن‌و بەهێزەکانیـش بەهێزتر دەکـەن‌و زیاتر پەرەیان پێ دەدەن.

دڵخۆشـن بـەو پڕۆژانـەی کـە لـە مـاوەی ئەو سـاڵەدا ئەنجامیان داوەو بەو سەرکەوتنانەی کە تۆماریان کردووە. ئەوان تەنها بـە ڕابوردنی سـاڵەکانی تەمەنیان دڵخـۆش نین، بەڵکو بەو کارانە دڵخۆشـن کە ئەنجامیان داوە، چونکە بەسـەرچوون بێ سودی تەمەن، مایەی نیگەرانییە، نەك ئاهەنگگێڕان.

هاوکات بۆ سـاڵی ئاینده، تەنها هیواو خۆزگەو ئاواتیان پێ نییە، بەڵکو بە دڵێکی پـڕ هیواو ئاواتـەوە، چەندیـن بەرنامەو پڕۆژەیان بۆ ساڵی نوێ داناوە.

هەوڵ دەدەن ئەم ساڵیان لە پار باشتر بێـتو زۆرتریـن پـڕۆژەی بەنرخی تێدا بەرهەم بهێنن.

خۆشەویسـتان.. تەمـەن سـەرمایەی مرۆڤەو ئـەو مەودایەی کە پـەروەردگار بەخشیوێتی بە ئادەمیزاد تا تیایدا بتوانێت جیهان‌و بوونەوەر، ئاوەدان بکاتەوەو سوود بە خۆیی‌و دەوروبەری بگەیەنێت.

## یەکەم دڵۆپ

## سەرنووسەر

ژیانـی ئێمەش لەو سـاتو چرکانەی تەمەن پێك دێت، سوود وەرگرتنی دروست لە کاتەکانمان، سوودوەرگرتنە لە ژیانمان.

گەورەتریـن هـۆکارو نزیکترین ڕێگا، بۆ گەیشتن بە سـەرکەوتن‌و گەشەپێدان‌و پێشکەوتن، ئەوەیە کە هەر یەکێك لە ئێمە هەسـت بە بەرپرسـیاری بکات بەرامبەر بە کاتو نەیەڵێـت چرکەیەکی ژیانی بێ سوودوەرگرتن ڕابورێت!

دەبا هەموومان بە گیانێکی نوێ دیدێکی فراوان‌و نەخشەو بەرنامەی جۆربەجۆرەوە، بێینـە مەیـدان‌و لە کۆتایی ئەم ساڵیشـدا بـە بۆنـەی سـەرکەوتنی پـڕۆژەکان‌و جێبەجێکردنـی بەرنامەکانمـان ئاهەنگ بگێڕین‌و شـادمان بین بەوەی کە گەلایەکی تەمەنمـان لـە پێنـاوی کاری بەسـوودو خزمەتی وڵاتو نەتەوەدا وەریوە!

بـا هەریەکێـك لـە ئێمە، لـە خۆی بپرسێت:

لەم ساڵەدا چەند کتێب دەخوێنمەوە؟

چەند بابەتی جوان دەنووسم؟

چەنـد بیرۆکـەی جـوان پێشـکەش دەکەم؟

چـۆن بتوانـم یارمەتـی هاوکارانـم بدەم؟

چـۆن خەندە بخەمـە سـەر لێوان‌و فرمێسکی چاوان بسڕم؟

بـۆ ئاوەدانکردنـەوەی وڵاتەکـەم، بۆ پێشـکەوتن‌و سـەرکەوتنی، دەبێـت چی بکەم؟

بۆ گرنگیدان بە ژیان‌و تەندروسـتیم، بۆ ماڵ‌و خێزان‌و کەس‌و کارم، بۆ گەڕەك‌و شارو لادێم.. دەبێت چی بکەم؟!

هەر شاد بن...

# کارگێڕی بە گوفتار

خراپترین وەزیر ئەو وەزیرەیە کە پێشتر وەزیری کەسانی خراپ بووە، پێش تۆ

عەلی کوڕی ئەبو تالب

زۆرجوانە مرۆڤ لە پێناو نیشتمانەکەیدا بمرێت.. لەویش جوانتر ئەوەیە لە پێناویدا بژی

ئەلێکس کارل

ئایندەی کوڕ دایکی دروستی دەکات

ناپلیۆن بۆناپارت

پاڵەوان ئەو کەسە نییە کە لە هەموو کەس ئازاترە.. بەڵکو ئەو کەسەیە تەنها بۆ ماوەی پێنج خولەك لە کەسانی تر ئازاترە

ئەمەرسۆن

هەموو سپییەك بەز نییە.. هەموو ڕەشێکیش خورما نییە

پەندێکی عەرەبی

جیهان کتێبێکی جوانە.. بەڵام بێ سودە بۆ کەسێك کە نەتوانێت بیخوێنێتەوە

کارڵ کۆڵدۆنی

# کارگێڕی بە چیرۆك

OFFICIAL CHECK
1004180 08/13/2007
Pay To The Order Of WIL CONSTRUCTION COMPANY $5,00,000
FIVE HUNDRED THOUSAND UNITED STATES DOLLARS ONLY. Dollars
DRAWER: Wachovia Bank, National Association

## تەنها متمانە بەخۆبوون

دەگێڕنـــەوە بازرگانێکی گەورە نوقمی قەرزاری ببوو، خەریکبوو ئیفلاسی دەکرد، هیچ ڕێگایەکیشـی لە بەردەمدا نەبوو بۆ ڕزگاربوون لـەم گرفتە، ناچـار بۆئەوەی تۆزێك پشـوو بدات، ڕووی کردە باخچەی گشتی شارو لەسەر کورسـییەك دانیشتو بەوپەڕی خەمبـاریو نیگەرانییەوە بیری لەوە دەکردەوە کە دەبێت کەسێك هەبێت بتوانێت خۆیو کۆمپانیاکەی لە ئیفلاس بوون ڕزگار بکات!

لە نـاکاو کابرایەکی پیـر پەیدا بوو، لە تەنیشتییەوە لەسەر کورسییەك دانیشتو لێی پرسی: وەکو ئەوەی شتێك بێزارت بکات؟

ئەمیش هەموو باسەکەی بۆ گێڕایەوە، دوای ئـەوەی گوێبیسـتی وتەکانـی بوو، گوتی: من دەتوانم یارمەتیت بدەم، تا لەم قەیرانـە ڕزگارت ببێت، دواتر پرسـیاری ناوەکـەی لێکـردو چەکێکی نیـو ملیۆن دۆلاریی بۆ کردو خستییە نێو چنگیو پێی گوت: سـاڵێکی ترو لەم شـوێنەدا یەکتری دەبینینـەوەو پارەکـەم بـۆ دەگێڕیتەوە، پاشان شوێنەکەی بەجێهێشت.

کابـرای بازرگان، سـەری سـوڕمابوو، چەکێکی نیو ملیۆن دۆلاری لە دەست دایەو بە ئیمزای (جون، دی، ڕۆکفلر) کە یەکێکە لە گەورە دەوڵەمەندەکانی جیهان.

لە ئەنجامدا بەوپەڕی حەماسـەتەوە گوتی: ئێسـتا دەتوانم بـەم پارانە هەموو کێشـەکانم چارەسـەر بکـەم، نیگەرانیم بسـڕمەوە، پـاش بیرکردنەوەیەکی کورت بڕیاری دا کە پارێزگاری لەو چەکە بکاتو هەوڵی پاراسـتنی کۆمپانیاکـەی بدات لە ئیفلاس بوونو هەوڵ بـدات تا دەتوانێت هیچ لەو پارەیە سەرف نەکات.

هـاوکات ئـەو چەکـە بوو بە سـەرچاوەی دڵنیایـیو هێز بـۆ ئەو، لەبەرئـەوە بەوپەڕی هیـواوە دەسـتی بـە کارکـردن کـردەوەو سـەرکەوتووانە دانوسـتانی ئەنجـام دا، لەگەڵ ئـەو لایەنانەدا کە قەرزیان لەسـەرێتیو توانی مۆڵەتیـان لـێ وەربگرێت بۆ دواخسـتنی کاتی قەرزەکان.

دوای ئەنجامدانی زنجیرەیەك کاری بازرگانی سـەرکەوتوو توانی هەموو قـەرزەکان بداتەوەو دواتـر کۆمپانیاکـەی گەڕایەوە دۆخـی جارانو جارێکی تر قازانجی باش دەستی پێکردەوە.

دوای تەواوبوونـی سـاڵێکی دیاریکراو لە لایەن پیرەمێردەکـەوە کابرا گەڕایەوە بۆ لای پیرەمێردەکـەو بینـی لە باخچەکەدا لەسـەر کورسییەك دانیشتووەو چاوەڕوانی ئەم دەکات.

لە خۆشیدا خۆی پێ نەگیراو یەکسەر چەکەکەی دەرهێناو بەوپەڕی سوپاسـەوە هەموو باسەکەی بۆ گێڕایەوە، بۆی باسکرد کە چۆن توانیویەتی کێشـەکان چارەسەر بکات بێ ئەوەی چەکەکە سەرف بکات.

لـەم کاتـەدا پەرسـتارێك قسـەکانی پێ بـڕیو دەسـتی پیرەمێردەکەی گرتو گوتی: سـوپاس بۆ خودا تـۆم دۆزییەوە. بـە دەوڵەمەندەکەشـی گـوت: هیـوادارم نەبووبێتە مایـەی بێزارکردنی جەنابت.. چونکە ئـەم بەردەوام لە نەخۆشـخانەی شـێتان ڕادەکات.. کـە لـە نزیکـی ئـەم باخچەیەوەیە.. وا گومان دەبات «جۆن دی ڕۆکفلر»ە!

کابرا لە سەرسوڕماندا حەپەساو بیری لە ساڵی ڕابردوو دەکردەوە.. کە چۆن توانی کۆمپانیاکەی ڕزگار بکاتو لە ئیفلاسبوون بیپارێزێت؟!

لەم چیرۆکەوە فێر دەبین کە:

١- هەموو کێشەیەك چارەسەری هەیەو زۆر جار هۆکاری چارەسەرەکە لای کەسێکی ترەو دەتوانین سودی لێ وەربگرین.

٢- پێویسـتە بۆ چارەسەری کێشەکان لە کەشێکی هێمندا بیر بکەینەوەو ناکرێت لـە کەشو هەوایەکـی جەنجاڵدا. بتوانین چارەسەر دیاری بکەین.

٣- متمانە بەخۆبوونو هیمەتبەرزی، خاڵی سـەرەکی هێزو توانـای ئێمەیەو بە بڕوابەخۆبـوون دەتوانین بەسـەر هەموو کێشەکاندا زاڵ ببین.

٤- کاتێك کابرای بازرگان توانی بەسـەر کێشـەکانیدا زاڵ ببێـتو بێئـەوەی هیچ لە چەکەکە سـەرف بکات، بۆمـان دەردەکەوێت کـە نهێنـی سـەرکەوتن لە خـودی خۆیەوە سەرچاوەی وەرگرتبوو.. نەك لەو بڕە پارەیەی کە لەسەر چەکێکی وەهمی نووسرابوو.

٥- بەرخودانو هەڵسانەوەی دوای شکست.. گوڕو تینێکی نوێ بە خاوەنەکەی دەبەخشێو داهاتوویەکی باشتر چاوەڕوانی دەکات.

بەشی چوارەم

# سەرکردایەتی

ئا: هەڵگورد مەسعود شاکر

### خۆگونجاندنی سەرکردەییانە:

لەو کاتەی دەتەوێت سەرکردایەتی کەسانی تر بکەیت بە پیشەکەت، دەبێت لەوێوە دەست پێ بکەیت بەوەی کە هێزو تواناو زانیاری ئەوان لە کوێدان، یان ڕاستییەکان لە کوێیە سەبارەت بە وان، لە کوێوە دەست پێدەکات؟ لە بەرنامەی زمانەوانی دەماری <NLP>(*) ئەمیان هەمووکات هەنگاو دەنێت بۆ خۆگونجاندن.

یەکەم شت کە ڕووبەڕووی خەڵك دەبێتەوە سەرەتا ستایشیان دەکەین لە جیهانی تایبەتی خۆیاندا، دەتەوێت بزانی چی گرنگە بە لای ئەوانەوە بە بێ ئەوەی هەوڵی گۆڕینی بدەیت، چونکە تۆ لەو کاتەی هەوڵ دەدەیت بزانیت چی گرنگە بە لای ئەوان ئەو کات دەست دەکەیت بە بیناکردنی متمانە لە هەستو دەروونی ئەوان، لەم ڕوانگەیەوە درك بەوە دەکەیت کە ئایا ئەوان پێویستیان بەچ جۆرە سەرکردەیەکە «سەرکردەیەکی کاریگەر، یاخود چاك، چونکە خەڵك جیاوازی لە نێوان ئەم دوو چەمکەدا ناکەن کە زۆر لێك جیاوازن، (هیتلەر) سەرکردەیەکی کاریگەر بوو، بەڵام (ڕۆزفێلت) سەرکردەیەکی چاك بوو». لە دواجاردا دەتوانیت ئەو شتە بدۆزێتەوە کە بە لای ئەوانەوە گرنگە، دەبێت تۆ ئەو هۆکارە گرنگە بکەیتە ئامرازێك لە ڕاکێشانی سەرنجی ئەوان بۆ لای خۆت، بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا تۆ وەك سەرکردە، ئەوانیش بە سیفەتی شوێنکەوتوویی پێکەوە بگەن بە ئامانجە هاوبەشەکەتان.

کەواتە زانینی شتە گرنگەکانی ئەوان دەبێتە بەردی بناغەی پردی نێوان سەرکردەو ئەوان، لەو کاتەی کە تۆ ئەو کارە ئەنجام دەدەیت دەتوانی ببیتە سەرکردەی کەسانی ترو دەتوانیت خۆت لەگەڵیاندا بگونجێنیت، بەڵام گرنگی نەدان بە هەڵسوکەوتو بەهاکانیان بێگومان خۆگونجاندن کارێکی ئەستەم دەبێت، ئەگەر ئەم هەوڵەش سەری نەگرت ئەو کات چۆن بەوە ڕازی دەبن تۆ سەرکردەیان بیت، یاخود وەك سەرکردەیەك مامەڵەت لەگەڵدا بکەن.

سەرکردە بۆ ئەوەی دڵی شوێنکەوتووەکانی بەدەست بهێنێتو بەو جۆرە بگونجێت لەگەڵیاندا، دەبێت گوێیان لێبگرێت، تاکو بە ڕوونی بزانێت ئەوان چیان دەوێتو چیشیان لا گرنگە، بێگومان سەرکردەی لێهاتوو بۆ ئەم لایەنە گوێگرێکی لێزانە، بەم جۆرە دەتوانێت بە باشی لەوان تێبگات، چونکە ئەو بە ڕوونی تێگەیشتووە کە ئەوان دەیانەوێت چییان بۆ بکرێت.

لێرەدا (سێ) ڕێگا هەیە بۆ خۆپاراستن لەخراپ تێنەگەیشتنو هەست بریندار نەکردنی کەسەکان لە بەرامبەر گوفتارو کەسایەتی سەرکردەدا:

یەکەم: دەبێت سەرکردە پرسیار لە عەقڵی خۆی بکات، ئایا نەخشەی کارەکانی بە شێوەیەکی عەقڵانی کێشاوە سەبارەت بەوەی کە بینیویەتیو بیستوویەتی لە شوێنکەوتووەکانی؟

دووەم: بە باشی لێکدانەوە بکات بۆ ئەو دەرەنجامەی کەوا پێی گەیشتووەو هەستی بەرامبەری بەو دەرەنجامانە بزانە، ئایا ئەو دەرەنجامانە شایستەی جێبەجێ کردنن؟ ئەگەر هاتوو ئەو مانایەی کەوا بەدەستی هێناوە بەشێوەیەکی کرداری هەمان ئەو مانایە بێت کە شوێنکەوتووەکانی مەبەستی بووە.

سێیەم: دەبێت دڵنیا بێت لە هەنگاوەکانی، داوایان لێ بکات کەوا چۆن گەیشتوونەتە ئەو دەرەئەنجامە، سەیری ئەوەش بکە ئایا هیچ زیرەکییەك هەبووە لە هەنگاوەکانیاندا؟

### جۆرەکانی سەرکردایەتی:

لێرەدا تیشك دەخەینە سەر جۆرەکانی سەرکردە بەپێی جیاوازییەکانیان لە رووی پاڵنەرایەتیو توانای بڕیاردانو شێوازی هەڵسوکەوتەکانیان، کە ئەویش هەر یەك لە سەرکردەی خۆسەپێن، سەرکردەی دیموکراتی، سەرکردەی فەرمی، سەرکردەی نا فەرمی، سەرکردەی ئۆتۆقراتی، سەرکردەی کەسی، سەرکردەی نا کەسی، سەرکردەی کارا، سەرکردەی بێسەروبەر، سەرکردەی سەرکەوتوو. هەر لە باسی سێیەمدا باس لە تیۆرەکانی (نظریات) سەرکردایەتی دەکەین کە خۆی لە تیۆری نیشانەکان، تیۆری هەڵوێست، تیۆری کارلێککردن دەبینێتەوە، دواتر هەر یەك لەو چەمکانە بە پوختیو بە روونی دەخەینەروو.

### یەکەم/ دابەشکردنی جۆرەکانی سەرکردایەتی:

هیچ یەکێك لەم جۆرانەی سەرکردایەتی ناتوانن جێگای جۆرێکی تر بگرنەوە، ئەم جۆرانە هەمان گرنگیان نییە وەکو یەك، هەر یەك لە مانە تیشك دەخاتە سەر تایبەتمەندییەکی دیاریکراو لە کەسایەتی سەرکردە، ئەمەش لە دوای باسکردنی جۆرەکانیان بە روونی دەردەکەوێت.

#### ١- سەرکردایەتی خۆسەپێن:

ئەم جۆرە لەسەر ئەو بنچینەیە دروست دەبێت کە سەرکردایەتی مافێکە دەدرێتە ئەو کەسەی کە دەسەڵاتی بە دەستە، سەرکردەش لێرەدا بەوە جیا دەکرێتەوە کە زۆر توندوتیژە "شێوازێکی خراپو نەشیاو بەکاردەهێنێت لە شێوەی سزادانو دەرکردنو ترساندنو فشار خستنەر" بۆ ئەو کەسانەی کە لەبەر دەستی کار دەکەن لەگەڵ چاودێرییەکی توند لەسەریان، هیچ کاتێك هاوبەشی کەسانی تر قبوڵ ناکاتو بە تەنها بڕیارەکان دەردەکاتو کەسانی بەردەستیشی جێبەجێی دەکەن، بە بۆچوونی ئەم جۆرە سەرکردەییە پشت بەستن بە توندوتیژیو بەکارهێنانی ئەم جۆرە شێوازانە کەسەکان پابەند دەکات بۆ ئەوەی کارەکانیان بە باشی ئەنجام بدەن، ئەویش بۆ بە دەستهێنانی ئامانجە دیاریکراوەکانی خۆی.

#### ٢- سەرکردایەتی دیموکراتی:

ئەم جۆرەیان لە سەرکردایەتیکردن پشت دەبەستێت بە هاوسەنگیو تێرکردنی پێداویستییەکان بۆ تاکەکان، تاوەکو هەردوولا رێزی یەکتر بگرن، سەرکردایەتی دیموکراتی بەوە جیا دەکرێتەوە لەوانی تر کە هاوبەشی بە کەسانی بەردەست دەکاتو رایان وەردەگرێت "شێوازی هاوکاریو لێك تێگەیشتن بەکاردەهێنێت بۆ جێبەجێکردنی کارەکان، چونکە خودی سەرکردە یەکێکە لەو کۆمەڵە کەسەی کە سەرکردایەتیان دەکات" لێرەدا سەرکردە پێشنیاری کارەکانی دەکاتو رای خۆی دەردەبڕێت، بەڵام چاوەڕێی رەزامەندی کۆمەڵ دەکات پێش ئەوەی بیخاتە بواری جێبەجێکردنەوە، ئەو جۆرە شێوازە یارمەتیدەردەبێت بۆ ئەوەی بارودۆخێکی رێکخراوو گونجاو بێتە کایەوە بۆ کارکردنو دروستکردنی گیانی یەك دەستەیی لە نێوان هەموو ئەندامان.

#### ٣- سەرکردایەتی فەرمی:

سەرکردایەتی فەرمی لە فەرمانبەرایەتیو جێگای تایبەت لە هەیکەلی کارگێڕی دروست دەبێت لە ناو دەزگادا، بوونی ئەم جۆرە سەرکردایەتییە بە خوێندنەوەی پێشوو پێویست دەبێت بۆ تەواوکردنی کارەکانو گرنگی پرۆژەکە، چونکە لێرەدا سەرکردە بە گوێرەی ریزبەندی فەرمانبەرێتی دەبێت، یاخود بە پێی هەڵبژاردنی خاوەنی ئەو دەزگایە دەبێت کە کەسەکە هەڵیدەبژێرێت بۆ سەرکردایەتی کردنی دەزگایەکە. پێدانی پۆستو دەسەڵاتەکانی سەرکردایەتی کردنیش بە شێوەی نوسراو و مەراسیمی فەرمی دەبێت.

#### ٤- سەرکردایەتی نا فەرمی:

ئەو سەرکردایەتییە کە لە ناو کۆمەڵێك کەسانی کارکەر دروست دەبێت بێئەوەی ببەسترێتەوە بە کارێکی فەرمی، یاخود پۆستێك، بەڵام بە شێوەیەکی نارێكوپێك دروست دەبێت کە پێشتر خوێندنەوەی بۆ نەکراوەو پلانی بۆ دانەنراوە، ئەوەی لێرەدا کەسی سەرکردە جیادەکاتەوە لە کەسانی تر، بریتییە لە تەمەنو زمان پاراویو لێهاتوویی کەسەکە لەوانی دیکە. واتە لە شوێنێکی وەك کۆمپانیایەك بە سیفەتی ئەوەی کەسێك هەیە لە رووی ئەزموونو شارەزایی باشتر دەتوانێت رۆڵی خۆی ببینێت، بۆیە رۆڵی سەرکردەی پێ دەبەخشن.

#### ٥- سەرکردایەتی ئۆتۆقراتی:

ئەم جۆرە سەرکردایەتییە لە سەرکردایەتی خۆسەپێن دەچێت، بەڵام خاڵی جیاواز لە نێوان ئەو دووجۆرە سەرکردایەتی کردنەدا ئەوەیە کە سەرکردایەتی ئۆتۆقراتی هەوڵدەدات کەسانی بەردەستی رازی بکات، بەوەی گوایە گوێ لە بیروبۆچوونەکانیان دەگرێت بە شێوەی گفتوگۆیەکی کراوە، کە ئامانج تێیدا ئەوەیە کە وا نیشانی بەردەستەکان بدات رایەکانیان وەرگیراوە، بەڵام لە راستیدا ئەم جۆرە سەرکردانە هیچ حیسابێك بۆ کەسانی تر ناکەن، چونکە بە پێی ئەو دەسەڵاتە بەرزەی هەیانە جێبەجێکردنی کارەکانو بڕیاردان هەر هەمووی خودی خۆی دەریان دەکات، بەبێئەوەی گرنگی بە بیروبۆچوونی کەسانی تری ناو دەزگا بدات.

#### ٦- سەرکردایەتی کەسی:

ئەم سەرکردایەتییە بریتییە لە شێوەیەکی کەسی کە رووبەڕوو ئەنجام دەدرێت، بە چالاكو سانایی جیادەکرێتەوە لە جۆرەکانی تری سەرکردایەتیکردن، لەگەڵ رێزگرتنی کەسانی تر لە ناو سنووری رێکخراوەکە.

#### ٧- سەرکردایەتی ناکەسی:

ئەم سەرکردایەتییە کە لە رێگای یارمەتیدانی کەسانی تر بۆ سەرکردە دەبێت لەسەر بنەمای سپاردنی دەسەڵات بە کەسانی تر، بە تایبەت لە داموو دەزگا گەورەکاندا کە چالاکی جۆراوجۆریان هەیەو هەندێجار کاریگەری کەسی لەسەر بەردەستەکان دەبێت بە هۆی ئەوەی کە هاورێیی کارن، بەڵام بە پلەی نزمتر.

#### ٨- سەرکردایەتی بێ سەروبەر:

ئاژاوەگێڕیو بێ سەروبەری ئەم جۆرە سەرکردەیە لەوەدایە ماوە دەدات بە ئەندامەکانی دەزگاکەی بە ئارەزووی خۆیان کاربکەنو بڕیار بدەن، هەرچی بیکەن بە رەوای دەزانن، بۆیە ئەنجامی ئەم جۆرە سەرکردایەتی کردنە دەبێتە هۆی بە فیڕۆدانی کاتو پشتگوێخستنی چالاکی گرنگو ماندوبوونو راڕایەکی بێ سوود.

#### ٩- سەرکردایەتی سەرکەوتوو:

یەکێك لە نیشانەکانی ئەم جۆرە سەرکردایەتییە ئەوەیە، کە سەرکەوتنو گەیشتن بە ئامانجەکان لە نێوان پلەکانی وەزیفی دا هەر یەکەو لە ئاستی خۆیدا بوونی هەیە، چونکە کاریگەریو سیفەتەکانی ئەم جۆرە سەرکردەیە بۆ سەر تەواوی ئەندامانیو خودی دەزگایەکە یەکجار زۆرە، ئەمەش لە ئەنجامی پشتبەستن بە راستییەکانو راوەرگرتنو توانای هەڵگرتنی بەرپرسیاریو بوونی توانای وەرگرتنی متمانەی خەڵك لە سەرکردایەتی کردنەکەیدا.

# بەڕێوەبەرەکەت بناسە

بەشی یەکەم

د.محەممەد فەتحی
پسپۆر لە گەشەپێدانی مرۆیی و
پێشخستنی داهێنەرانە

و: گۆران جەمیل

گومانی تێدا نییە کە جۆرەها بەرپرس و سەرۆك کار هەیە لە واقیعی کرداری و ژیانی ڕۆژانەماندا، بەلام ئەوجۆرەی کە ڕاپەراندنی کارەکان پەك دەخەن و لە هەمان کاتدا بەربەست دەخەنە سەر ڕێگای تەواوکردنی، ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانە پێویستیان بە وەیە کە هەڵسوکەوتی تایبەتیان لەگەڵدا بکرێت! لە خوا دەپاڕێینەوە کە بەڕێوەبەرەکەی تۆ، یان سەرۆکەکەت لەم جۆرانە نەبێت، ئەو جۆرە سەرۆك و بەڕێوەبەرانەش ئەمانەن:

**بەڕێوەبەری توڕە:**

کەسایەتی ئاوهایە:

١- دڵی باشە.
٢- زوو توڕە دەبێت.
٣- مەزاجییەو زوو هەڵدەچێت.
٤- هەست دەکات کە پێویستە پەلە بکات لە هێرش کردنە سەرکەسانی تر، پێش ئەوەی کە ئەوان هێرشی بکەنە سەر.
٥- متمانەی بە کەس نییە.

**چۆنییەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەدا؟**

١- لێرەدا با ئامانجت ئەوە بێت دووربیت لەو شتانەی کە کاردەکەنە سەر هەڵچوونی سەرۆکەکەت و دەیوروژێنێت بۆ توڕەبوون.

٢- خۆت بپارێزە لە توڕەبوون، گوێی لێ بگرە بە بێ دەنگییەکی تەواوەوە.

٣- ڕووبەڕووی توڕەبوونەکەی مەبەرەوە، هەوڵ مەدە هێرشی هاوشێوەی بکەیتە سەر، ئەمەش بۆ ئەوەی کێشەکە گەورەترو ئاڵۆزتر نەبێتەوە، تا لێکترازان و دابڕان ڕوونەدات لە نێوان تۆو سەرۆکەکەتدا لە هەموو بوارەکاندا .

٤- ئەگەر پێی بە زەویدا دا، تۆ پێت بخەرە لاوە.

٥- مادام دەموچاوی داوە بە یەکداو خۆی مرومۆچ کردووە، تۆ وا لە دەموچاوت بکە هێمن بیت نەك پێکەنیناوی.

٦- مادام ئەو دەستی توند نوقاندووە، تۆ دەستت بکەرەوە.

٧- کاتێك کە هاوار دەکات تۆ با دەنگت هێمن و لەسەرخۆ بێت.

٨- هەمیشە ئەم وشانە بخەرە سەر زارت (ناکرێت سەرزەنشتت بکەم)، (ئەگەر من لە جێگای تۆ بوومایە هەمان هەستی تۆم دەبوو).

٩- چاوەڕوان بە هەتا تەواو هێمن دەبێتەوە، پاشان بۆچوونەکانی خۆتی بخەرە پێش چاو، یان ڕاڤەی هۆی هەڵەکەی بۆ بکە بە هێمنی، ئەگەر تۆ هەڵەت کردبوو ئەوە دان بە هەڵەکەتدا بنێ.

١٠- ئەگەر توڕەبوونەکە لە تۆوە نەبوو، بەڵکو لە یەکێك لە هاوپیشەکانت بوو، لە هەمان کاتدا شایەنی ئەو توڕەبوون و سەرزەنشتە نەبوو، چاوەڕوان بە، هەتا سەرۆکەکەت هێمن دەبێتەوە، پاشان ئەوەی بە سوودە پێشکەشی بکە سەبارەت بەوەی کە هاوپیشەکەت بەرپرس نییە لەو هەڵەیە، بە شێوەیەك قسە بکە کە سەرزەنشتی سەرۆکەکەت نەکەیت، لە سەرئەوەی کە توند بووە لەگەڵ هاوپیشەکەتدا، باوا گومان نەبات کە تۆ دەست دەخەیتە کاروبارەکانییەوە، یان خۆت لە کارێك هەڵدەقورتێنیت کە پەیوەندی بە تۆوە نییە، ئەمە وا دەکات کە بەبێ هۆ هەڵبچێت و لە تۆش توڕە ببێت.

**بەڕێوەبەری ڕاوکەری هەڵە:**

کەسایەتی ئاوهایە:

١- تێڕوانین و بۆچوونەکانی تەسکە.
٢- توانج دەدات لە تەگەرەو هەڵەکان.
٣- بەدواداچوون بۆ هەموو کارەکان دەکات، بە وردی و زیادەڕەوی تێدا دەکات.

٤- کەسێکی گێرەشێوێنە، هەمیشە پەنا دەباتە بەر توندوتیژی لە قسەکردندا.

٥- ئارەزوومەندە کارەکان بە شێوەیەکی نموونەیی ئەنجام بدرێت.

## چۆنییەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەدا؟

١- با ئامانجت ئەوە بێت کە دەربچیت لە سندوقی کۆیلایەتی ئەم سەرۆکە، ئارەزوومەند بە کە هەناسەیەك هەڵمژیت بەبێ بوونی ئەم سەرۆکەو لەگەڵ تەواوکردنی کارەکەت بە باشی.

٢- سەرەتا سەرۆکەکەت لە سەر حەقە، لەوەی پێداچوونەوەی کارەکانت بە وردی بکات، جا ئەگەر هەوڵ بدات دڵنیابێت لەوەی کە ئایە کارەکەت هەروەك داواکراوە ئەنجام دراوە لە کاتی خۆیدا.

٣- دادپەروەری با ڕێگاو ڕێبازی تۆبێت لە کارەکەتدا، بەڵام زۆر وردتر بە.

٤- تورە مەبە لە هەڵسوکەوتی سەرۆکەکەت، بەڵکو با ڕووخسارت هێمنو بە بزە بێت بەرەو ئەنجامدانی کارەکەت بە یەکەمجار، پاشان پێداچوونەوەی بۆ بکە بە باشی.

٥- ئەگەر پێوەر هەبوو بۆ کارکردن، ئەوا هەوڵ بدە پەیڕەوی بکەیت، ئەگەر نا ئەوە هەوڵ بدە تۆ خۆت داینێ، لەسەر ڕەزامەندی سەرۆکەکەت.

٦- ئەگەر هەستت کرد کە هەڵەیەك هەیە لە کارەکەتدا، ئەوە پێش ئەنجامدانی پرسو ڕا بە سەرۆکەکەت بکە لە سەر چۆنییەتی دەرباز بوون لەو هەڵەیە، بەڵام ئەگەر کەوتیتە ناو هەڵەکەوە، سەرۆکەکەت ڕووبەڕووت وەستایەوە، هۆکاری هەڵەکەی بۆ ڕوون بکەرەوەو بە باشی گوێی لێ بگرە بزانە چی دەڵێتو کار بە ئامۆژگارییەکانی بکە.

٧- وریا بەو خۆت بپارێزە لە دووبارەبوونەوەی هەمان هەڵە بۆ جارێکی تر.

٨- سەرنجی ڕابکێشە بۆ ئەو شتانەی کە گرنگییان زیاترە، لە پێناوی بەرژەوەندی کاردا، بۆ نموونە یەکلایی بوونەوە بۆ ئامانجە بڵندەکان، ئەمەش بە هیوای ئەوەی کە دەست هەڵبگرێت لە چاودێریو پشکنینی کارەکانی تۆ.

### بەڕێوەبەری جەللاد:

کەسایەتی ئاوهایە:

١- پێی باشە کە تۆ هەست بە گوناه بکەیت، ئیدی گرنگ نییە کە هۆکاری ڕاستەقینەی مەسەلەکە چییە.

٢- پێی باشە کە ڕەخنە بەکار بهێنێت، هەرچی ڕووبدات لە بەرژەوەندی ئەودا بێت.

٣- هەڵەکان بەکار دەهێنێت، هەتا قەناعەت بە تاوانبار دەکاتو بە سەریدا زاڵ دەبێت، بە دەستییەوە دەگرێت، وا دەکات کە کەسەکە ببێت بە نێچیری هەستکردن بە تاوان.

٤- بەکارهێنانی هونەری سەرزەنشتکردنی کەسانی تر، تا بڵێت ئەوان شایەنی ئەوەن کە ئێستا ئاوا ئازار دەچێژن.

٥- هەموو یارمەتییەك ڕەت دەکاتەوە کە لە لایەن کەسی تاوانبارەوە پێشکەش بکرێت، پاش ئەوەی کە هەستا بە سەرزەنشتو ڕەخنەگرتن لێی لە سەر ئەو کارەی کە ئەنجامی داوە.

٦- متمانەی بە کاری هیچ کەس جگە لە خۆی نییە، تەنانەت ئەگەر کارەکە بە سەرکەوتوویش ئەنجام درابێت، هەمیشە بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت کە دڵەڕاوکێ لە دڵی تاکدا دروست بکات، وا دەکات کە هەست بە گوناه بکات.

## چۆنێتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەدا؟

١- با ئامانجت ئەوە بێت کە چۆن ڕزگارت بێت لە سەرزەنشتو ئازارو پەستی، کە سەرۆکەکەت بەرامبەرت ئەنجامی دەدات.

٢- بە ڕوونیو بێ پێچوپەنا قسەی لەگەڵدا بکە، سەبارەت بە هەڵەکەتو مەودای بەرگەگرتنی بەرپرسیاریت چەندە، پێویستە ئەم خاڵە تێپەڕێنیت، ئەوە بزانیت کە چەند کارت ئەنجام داوە ‌ە ڕابردوو داهاتودا.

٣- ئەگەر هەڵەکە هەڵەی تۆ نەبوو، هەڵەی کەسانی تر لە ئەستۆ مەگرە، بە هێمنیو بە ئەدەبەوە ئەوەی بۆ ڕوون بکەرەوە کە ڕۆڵی ڕاستەقینەو بواری بەرپرسیارێتی تۆ، هەروەها نەبوونی بەرپرسیاری تۆ لە وەی کە ڕوویداوە.

٤- ئەگەر هەڵە لە لای بەڕێوەبەرەکەت بوو، بەرپرسیارێتییەکانی خۆی بۆ ڕوون بکەرەوە، بە بێ هەست بریندارکردنی، ئەو بە باشی ئەم هونەرە دەزانێتو لە تۆیش لە پێشترە تێیدا.

٥- ڕەوشتە باشەکانی بیربخەرەوە وەکو: دادپەروەری، لێبوردەیی، دڵپاکی، هەموو ڕاستییەکانی بە ڕێزەوە بۆ ڕوون بکەرەوە.

٦- شێوەی چارەسەرکردنی کێشەکانی بۆ باس بکە، بە لۆجیكو زنجیرەبەندی گونجاو، ئەو کات ڕۆڵی تۆو ئەویش، هەروەها هاوڕێکانیشت دەردەکەوێت.

٧- لەو هەڵەیەی ئەنجامت داوە ڕامەکە، هەموو شتێك بە ئەندازەی خۆیەتی، هەڵەی کەسانی تر هەڵمەگرە، تەنانەت ئەگەر هی سەرۆکەکەشت بێت.

### بەڕێوەبەری توندوتیژ:

کەسایەتی ئاوهایە:

١- کار دەکات وەك ئەوەی کە چاو بەست لە چاویدا بێت.

٢- کەسێکی کەللە ڕەقە.

٣- زانیاری سەبارەت بە مەسەلەکان زۆر کەمە.

٤- گوێ لە کەس ناگرێت، توندە لەگەڵ کەسانێکدا کە موناقەشەی لەگەڵدا دەکەن.

٥- دەیەوێت هەرچی ئەو وتی جێبەجێ بکرێت.

٦- هەست بە خەجاڵەتی دەکات ئەگەر بۆچوونی، یان نەخشەکەی لە سەرداوای سەرووی خۆی، بگۆڕێت.

## چۆنییەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەدا؟

١- با ئامانجت ئەوە بێت کە کارەکەت ڕابپەڕێنیت بەبێ کۆتوبەند، بەبێ ئەوەی کە کەس دەستبخاتە کاروبارتەوە، ئازادی دەربڕینی بۆچوونت هەبێت.

٢- ئەگەر سەرۆك نەخشەی ئامادەکراوی پێشکەش کردی، پێویستە لە سەرت جێبەجێی بکەیت و بەس، بە دوای بیری تازەدا بگەڕێو داوای لێ بکە، ئەگەر ڕێگا بدات.

٣- ئەوە هەندێ پێداچوونەوەی تازە بۆ نەخشە گەورەو نایابەکە بکرێت پشتگیری بۆ بۆچوونەکانت بکە، پێشنیاری بۆ بکە سەبارەت بەوەی کە چۆن بتوانرێت تێچوون کەم بکرێتەوە، داهات زیاد بکرێت، قەبارەی ئاستی هەڵەکان کەم بکرێتەوە.

٤- متمانەت هەبێت بەوەی کە سەرۆکەکەت بۆچوونی دەگۆڕێت.

٥- سۆزی سەرۆکەکەت بجوڵێنەو یاری لەگەڵ هەستو ژیری بە یەکەوە بکە، هەندێجار دادپەروەر دەبێت لەگەڵ پێشنیارەکانتدا، بۆ ئەوەی ئاوی دەموچاوی بپارێزێت لە بەرامبەرت، لەسەر ئەم کارەی هاندەری بە، هەتا دیواری ڕقی دەڕوخێت کە بۆ دەروونی خۆی دروستی کردووە.

٦- ئەگەر سەرۆك بۆچوونی نەگۆڕی، گوێڕایەڵی بکە، نەکەیت هەرگیز ڕەخنەی لێ بگریت، بەڵام هەوڵ بدە بە نوسراو ڕەتکردنەوەی پێشنیارەکانت لە لا هەبێت. لە لای کەس گفتوگۆی ئەم مەسەلانە مەکە، با تەنها لە نێوانی تۆو ئەودا بێت.

٧- ئارام بگرە هەتاکو لە پلەکەی دەیگۆڕن، یان واز لە دامەزراوەکە دەهێنێت، یاخود بۆ یەکجاریماڵئاوایی دەکات.

بەشی دووەم

# بەڕێوەبردنی داواکاری

ئا: ئیبراهیم مستەفا خدر

٤- داواکاری نزمبوونەوە: مەبەستمان ئەوەیە کە ڕێژەی داواکاری بۆ بەرهەمی ڕێکخراو بەرەو کەمبوونەوە دەڕوات لەو حاڵەتە بەڕێوەبەری بازارسازی دەبێت هەوڵ بدات وەڵامی ئەم پرسیارەی خوارەوە بداتەوە: "ئایا داواکاری تەنیا لە ڕێژەی بەرهەم کەم بووەتەوە؟ یان کەمبوونەوەی داواکاری بۆ ناونیشانی بازرگانی ڕێکخراو دەگەڕێتەوە؟"

مەبەست لە ڕێژەی بەرهەم ئەوەیە کە بە شێوەیەکی گشتی بۆ ئەم بەرهەمە بە بێ گرنگیدان بە ناوو ناونیشانی، داواکارییەکان بەرەو کەمبوونەوە ڕۆیشتووە، یان بە شێوازێکی تر دەتوانین سووڕی ژیانی ئەم بەرهەمە بەرەو تەواوبوون دەڕوات. بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بە داواکاری لەسەر ئۆتۆمبێل لە کوردستان بکەین پێش ڕووخانی ڕژێمی دیکتاتۆرییەتو ئێستای کوردستان.

ئەگەر حاڵەتی سەرەوە ڕوویدات مانای ئەوەیە کە تەمەنی تەکنەلۆژیای ئەم بەرهەمە بەرەو نەمان دەچێتو بەرهەمەکانی نوێو باشتر لەگەڵ بەکارهێنانی جیاوازو زیاتر (بۆ کڕیارەکان) هاتووەتە ناو بازاڕو لەو ڕوانگەیە کە کڕیار سوودی بەدەست هاتوو لەو بەرهەمە دەکرێت نەك خودی بەرهەمەکە، چونکە بەرهەمەکانی نوێ هەمان سوود بە شێوەیەکی زیاتر بە کاریگەرییەکی بەهێزترو نرخێکی هەرزانتر لە بەردەم کڕیارەکان دادەنێت، ئەوا وادەکات کە سوود لە بەرهەمی نوێ وەربگرین. لێرەدا بەڕێوەبەری دۆزینەوەی بازاڕ دەبێت بزانێت کە دڵخۆش بوون بەو بەرهەمانە کە تەمەنی خزمەتگوزارییان تەواو بووە هیچ دەستکەوتێکی نییەو ڕێکخراو بەرەو نەمانو پاشکەوتن دەبات، باشتر وایە لە زووترین کاتدا بیر لە سڕینەوەی ئەو بەرهەمە بکاتەوەو بڕیار بدات خۆی لەگەڵ بازاڕ سازگارو هەماهەنگ بکات، بەڵام ئەگەر کڕیارەکان تەنیا ناونیشانی بازرگانی بەرهەم هاتووی ڕێکخراو نەکڕنو ڕوو لە بەرهەمەکانی هاوشێوەی ڕکابەران دەکەن، ئەوە بەو واتایە دێت کە کردارەکانی بەرهەم هێنانی شتومەكو دروستکردنی بەرهەم لە شوێنێك هەڵەی تێدایە. لەو حاڵەتە گونجاوترین کارو باشترین پێشنیار ئەوەیە کە ڕوو لە کڕیارەکان بکرێتو گفتوگۆیان لەگەڵ بکرێتو بە کۆکردنەوەی بیرۆکەو قسەی دڵیان ڕێکخراو بە خوێدا بچێتەوەو هەڵەکان چاکسازی بکات. ڕێکخراو بۆ بەردەوام بوون دەبێت بزانێت هەڵە لە یەك بەش (بەرهەم- نرخ- دابەشکردن- ئامێرەکانی پێشکەوتن- تەکنەلۆژیا- ڕیکلام و...هتد)ە، یان لە چەند بەشێك دایە ئەو کات دەکرێت ڕێژەی نارەزایەتی کڕیارەکان بە شێوەیەکی وردو زانستییانە لێك بدرێتەوە، ئەگەر دیاریکردنی هەڵەکان بە شێوەیەکی کورت ئەنجام بدرێت چارەسەرکردنی ئاسان دەبێت. لە ٨٠٪ قورسایی ئەم کارە لە دیتنەوەی هەڵەکانو لە ٢٠٪ لە چارەسەرکردنیانە، بەڵام ئەگەر ناسینەوەی هەڵەکان بە باشی ئەنجام نەدرێت ئەو کات بەکارهێنانی ئانتی بایۆتیك بۆ ماوەیەکی کاتی تای نەخۆش چارەسەر دەکات، بەڵام نەخۆشییەکە چارەسەر نابێت.

لەو بارودۆخەدا بەڕێوەبەرو ڕاوێژکارانی بە توانا بە پێداچوونەوەی تەواوی بارۆدوخەکە هەوڵ دەدەن چارەسەرێکی تایبەت بۆ ڕێکخراو ئامادە بکەن بە شێوەیەك کە ڕێکخراو گیانی تازە وەربگرێت.

٥- داواکاری وەرزی: بۆ هەندێك لە بەرهەمەکان لە وەرزێکی تایبەتدا داواکاری دروست دەبێتو لە وەرزێکی تر داواکارییان نییە، بەڕێوەبەری دۆزینەوەی بازاڕ دەتوانێت بە پێداچوونەوە کردنی تایبەتمەندییەکانو پێکهاتووەکانی بازاڕو بەرهەم یەکێك لە تێبینییەکانی خوارەوە ڕەچاو بکات:

أ- داواکاری لەو بەرهەمە لە حاڵەتی وەرزی بێنیتە دەرەوە، بە بەکارهێنانی دۆزینەوەی بازاڕی چارەسەرکراوە (گۆڕینی) هاوسەنگییەك دروست بکات لە نێوان هەموو وەرزەکانی ساڵدا، بۆ نموونە:

* یەکێك لە ناونیشانە بازرگانییەکانی بە ناوبانگی (ئایس کریم) توانیویەتی بە بەکارهێنانی شێوازەکانی دۆزینەوەی بازاڕ بە درێژایی وەرزەکانی سەرما بە هەمان شێوە بۆ ئایس کریمە بەرهەمهێنراوەکان داواکاری دروست بکات.

* یەکێك لە شاری یارییەکان بە داپۆشینی باڵەخانەو داخراوکردنی شارەکەو بە کارهێنانی ڕیکلامی بەهێز توانیویەتی بە درێژایی ساڵ بۆ یارییەکانی خۆی داواکاری دروست بکات.

ب- لە هەندێك بەرهەمدا توانای دۆزینەوەی بازاڕی چارەسەرکراو نییە، بۆ نموونە داواکاری لە سەر ئامێری ساردکەرەوەو گەرمکەرەوە، پێشنیارێك کە لەو حاڵەتە بە ڕێکخراو دەدرێت ئەوەیە کە هەر دوو بەرهەمی دژ بە یەك بەرهەم بهێنێت، تاکو بتوانێت لە تەواوی ساڵ کڕیاری هەبێت نەوەك لە هەندێك وەرزی تایبەتدا.

ڕەخنەیەك کە هەندێجار ڕووبەڕووی ڕێکخراوەکان دەبێتەوە، ئەوەیە کە ڕێکخراو دەبێت لە کاتی دەستنیشان کردنی ناوی بەرهەم وردبن بە شێوەیەك کە ناوی بەرهەم لەگەڵ تواناو چۆنێتی کارکردنی بەرهەم گونجاو بێت تاکو لە داهاتوودا ڕووبەڕووی هیچ کێشەیەك نەبیتەوە. بۆ نموونە شێورلێتی «نۆئا» لە هەموو جیهان بە ناوی کۆمپانیای بە هێزی دروستکردنی ئۆتۆمبێل ناسراوە، بەڵام لە ئیسپانیا سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا، چونکە لە فەرهەنگی ئەدەبی ئیسپانی (نوئا) بە مانای لەسەرخۆ دێت، دەستنیشانکردنی ناوی بەرهەم پرۆسەیەکی ئاڵۆزو زانستییە کە پێویست بە لێکوڵینەوەیەکی زۆر دەکات.

ج- پێشنیاری سێیەم ئەوەیە کە بەرهەمێك دروست بکرێت کە دوو بە کارهێنانی هەبێت بۆ نموونە سپلێت لە زستاندا گەرم کەرەوەیەو لە هاویندا کاری ساردکەرەوە دەکات، بەڵام لێرە ئەوە گرنگە کە کارکردنی ئەم ئامێرە لە هەر دوو حاڵەت دەبێت بەرز بێت، تاکو بتوانێت کرداری ڕاکێشانو پاراستنی کڕیار بە باشی ئەنجام بدات.

# ٩٠ خولەکییەکان

ئا: درەخشان بەهادین محەممەد

یەکێک لە گرفتە گەورەکانی ئادەمیزاد کەمتەرخەمیو دواخستنی کارەکانییەتی تا دوایین ساتو وەخت، پاشان جێبەجێکردنیان لە کۆتاییەکانو مۆڵەتی دیاریکراو. هەر ئەوەی کە لە ڕووی زمانەوانییەوە بە خولەکی (٩٠) ناویان بردووە... زۆرجاریش لە هەندێک بواردا بەردەوام دەبێتو سەر بۆ کاتو خولەکی زیادکراو دەکێشێت.

ئایا تا ئێستە کتێبێکت کڕیوە کە لە ساتو وەختی کڕینیدا، بە چاکترین کتێبی سەرگۆی زەویت زانیبێت.. بەڵام دوای تێپەڕبوونی چەند مانگێک، هێشتا لاپەڕەکانیت هەڵنەدابێتەوە؟ ئایا لەو کەسانەی کە سەرەڕای ئەوەی بە لای کەمەوە بەر لە هەفتەیەک پێش کاتی دیاریکراو، دەزانیت کە دەبێت بۆ بەشداریکردن لە بۆنەو مەراسیمێکدا، جلوبەرگێکی شیاو ئامادە بکەیت.. بەڵام ئێستا کە تەنها چەند کاتژمێرێک ماوە مەراسیمەکە دەست پێ بکات، هێشتا ئەو کارەت ئەنجام نەداوە؟ ئایا بۆتان نەهاتووەتە پێش کە ڕاپۆرتی ساڵانەی کارەکەتان دەبێت لە کاتی خۆیدا ئامادەبێتو بدرێت بە بەڕێوەبەر، تەنها ماوەیەکی کەم بەر لە دەستپێکردنی کۆبوونەوە ئامادە کرابێت.

ئەگەر دەتەوێت بەسەر ئەم خووە ناپەسەندەدا زاڵ ببیت.. بێ دوودڵی درێژەی ئەم بابەتە بخوێنەرەوەو کاری پێ بکە:

١- بەر لە دەستپێکردنی هەر کارێک، خۆت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر ئەگەرو پێشهاتێکی لە پڕی کارەکەت، ئامادە بکە.. بە پێچەوانەی ئەم خاڵە، بە شێوەیەکی نادیارو ڕەها، بۆ ماوەیەکی زۆر، ئەنجامدانی کارەکەت دوادەخەیت.

٢- هەر کاتێک لە هەر کارێکدا زیاتر لە ئەندازەی توانای خۆت ئومێدەوار بیت، لە جێی ئەوەی بۆ بەردەوامبوونی کارەکەت هان بدرێیت.. لێی بێزار دەبیت.

٣- ئەگەر یاسایەک دابنێیت و جێبەجێکردنی بۆ کەسانێک بە ئەرکو پێویست بزانیت.. بە جێبەجێنەکردنی لە لایەن کەسانی پەیوەندیدارو کارپێسپێردراو تووڕە دەبیت.. ئەم تووڕەبوونەش، تاک بەرەو کەمتەرخەمی، نەیاریو ڕقهەڵسان لەو کەسانەی کەمتەرخەمییان نواندووەو کاری دیاریکراویان ئەنجام نەداوە، دەبات.

٤- هەمیشە بەر لە دەستپێکردنی کارێکی دیاریکراو، لە خۆت بپرسە، ئایا ئەنجامدانی ئەم کارە، پێویستو گرنگە، کاریگەری لە ژینی مندا هەیە؟

ئەگەر وەڵامەکەت ئەرێ بوو.. ئەوا دەستبەجێو بێبیانوو هێنانەوە، دەستی پێ بکە.

٥- هەر کاتێک لە ڕووبەڕووبوونەوەی گرفتێک، یان ئەنجامدانی کارێکدا، خۆت بە لاوازو بێتوانا دێتە بەرچاو.. دووچاری دوودڵیو نیگەرانی دەبیت.. بەو جۆرەش بیانووی تەواوو پێویستت بۆ مێشکت ناردووە.

٦- هەر کاتێک تووڕەو شپرزەیت.. بڕیار لە ئەنجامدانی کارێک مەدە.. چونکە لە دوای نەمانی باری تووڕەییو پەرێشانیت، لەوانەیە ئارەزووت لە ئەنجامدانی ئەو کارە نەمێنێتو دووبارەبوونەوەی ئەم بارودۆخەش.. وا دەکات لە کەسێتی تۆدا، کەمتەرخەمی ببێت بە خوو.

٧- ئاکامەکانی کەمتەرخەمیت هەمیشە لە یاد بێت.. بەوەی کە ئەو لایەنو بوارانەی ژیان، کە کەمتەرخەمی تێیاندا بووە بە گرفت بۆت، بە بیری خۆتدا بهێنیتەوە.. دواتر هەوڵی دووبارەنەبوونەوەی ئەو باسو بابەتە لە داهاتوودا، بدە.

٨- لە بیرت بێت کە تۆ خاوەنی چەندین تواناو تایبەتمەندی خۆتیت، کە دەبێت کارەکانت لە کاتی خۆیداو بە بیرو ئەندێشەیەکی ڕێکو دروست دەست پێ بکەیتو لە کاتی دیاریکراویشدا، بە کۆتایی بگەیەنیت.. کەواتە خۆت بە کەمو بێتوانا مەزانە.

٩- هەر چەندە سەبارەت بە کارێک ئارەزو مەندتر بیت.. ئەوا زووتر ئەنجامی دەدەیت.

١٠- زۆرجار هۆکاری کەمتەرخەمی، خۆشیو چێژی ئەو ساتە وەختەیە کە تێیدا دەژیت.. ئەمەش بە پێچەوانەی کاری ئەو کەسانەیە کە لە بیری خۆشیو ئاسایشی درێژخایەنو بەردەوامدانو لە کاتی خۆیدا بە ورەیەکی بەرزو سنگێکی فراوانەوە، بەرەو پیری ناڕەحەتیو ئەگەرەکانی ئیشوکارەکەیان دەچن.

کەوابوو با چاوت لە ئەنجامی گەورەو بەردەوام بێت.. ئەویش بە ئەنجامدانی کارەکانت لە کاتو ساتی خۆیدا.. لەبەر

چەند ساتێك کەیفو خۆشی ئێستە، بە ئەنجامنەدانی کارەکەتو دواخستنی، ڕازی مەبە.

١١- گەشبین بە.. لە بری ئەوەی ئاهو ناڵەت بێتو بڵێی: من کە ناتوانم ئەم کارە لە کاتی خۆیدا تەواو بکەم.. دەی بۆچی دەستی پێ بکەم؟ بڵێ: من ئەم کارە ئەنجام دەدەمو لە کاتی خۆیشیدا تەواوی دەکەم.

١٢- لە سەرەتادا زۆربەی کاروبارەکان، بە سەختو دژوار دێنە بەر چاوتو لێیان بێزاریت.. بەڵام گەر دەست بە ئەنجامدانیان بکەیت.. ئەوا لات خۆشەویست دەبنو دەبن بە هۆی شادمانیت.

١٣- بە خۆت بڵێ: (دەبێت ئێستە دەست بەم کارە بکەم.. چونکە ئەو ڕەنجو ئازارەی لە چاوەڕوانیکردنی کاتو دەرفەتی شیاودا، تووشی دەبم.. لە ئەرکو ئەنجامدانی کارەکە کەمتر نییە).

١٤- بە خۆت مەڵێ: ئێستە پێویستیم بە حەوانەوەو پشووە.. ئەم کارەش لە ڕۆژێکی پشوودا ئەنجام دەدەم.. پشوو بێ پشوو!

١٥- لە بیرت بێت کە تێپەڕبوونی کات.. لە گرفتی ئێمە کەم ناکاتەوە.. کەواتە ئەو ئومێدە پووچو بێبنەمایە لە سەرت دەر بکە: کە ئێستە دەست لە هیچ کارێك نادەم.. سا بەڵکو بە تێپەڕبوونی کات، گرفتەکە بۆ خۆی چارەسەر ببێتو نەمێنێت.

١٦- با ئەنجامدانی کارەکانت بە خواستو بڕیاری خۆت بێتو لەبەر خۆت ئەنجامی بدە.. نەك لەبەر دەوروبەرو کەسانی دیکە.. چونکە ئەگەر پشتیوانیی تەواوت لە لایەن ئەوانەوە دەست نەکەوێت.. دڵسارد دەبیتەوەو کەمتەرخەم دەردەچیت.

١٧- ئەگەر کارێکت لە کاتی خۆیدا ئەنجام نەدا.. نابێت خۆت بە تاوانبار بزانیتو هەست بە شەرمەزاری بکەیت.. چونکە ئەفسوسو بەداخەوەبوونو هەستی شەرمەزاری، بەرەو لاوازیو بێتواناییو کەمتەرخەمیت زیاتر دەبات.

١٨- لە خۆت بپرسە ئەگەر ئێستە.. ئەم کارەی کە بە دڵمە ئەنجامی نەدەم.. چ کارو چالاکییەکی دیکە، چاکتر ڕادەپەڕێنم؟ ئایا ژیان بێهوودە بە فیڕۆ ناچێت؟

١٩- بۆ ئەنجامدانی ئەرکو کاری جێبەجێکراو لە کاتو وادەی دیاریکراودا.. شاباشو پاداشتی خۆت بکە، بۆ نموونە: تەماشاکردنی فیلمێکی سینەمایی کە حەزت لێیەتی بە مەرج بگرەو بیخەرە دوای تەواوکردنو خوێندنەوەی بەشێك لە وانەیەکت.

٢٠- کارەکانت هەر بەو جۆرەی کە گرنگو ڕێکخراوە، ئەنجامیان بدە.. نەك بەو ڕێکخستنەی کە دڵت دەیخوازێت.

٢١- کاتێك کارێك دوادەخەیتو درەنگ دەستی پێ دەکەیت.. لە ڕاستیدا شانسی باشتر ئەنجامدانی ئەو کارە لە دەست دەدەیت. کەواتە هەر چەندە کارەکە درەنگتر ئەنجام بدەیت.. ئەگەری خراپ ئەنجامدانی ئەو کارە زیاترە.

٢٢- لەگەڵ هاوڕێکانت، یان ئەندامانی خێزانەکەت لەسەر ئەنجامدانی کارێك لە کاتو ساتی خۆیدا ڕێك بکەوەو بەڵێنی بردنە سەری بدە.

٢٣- بە تەماشاکردنی تەلەفزیۆن، خوێندنەوەی بێئەنجام، گوێدانە مۆسیقا بە بیانووی هێورکردنەوەو سەیرکردنی دیمەنی بەردەم پەنجەرە،خۆت فریو مەدە.. ئەمانە هەموویان بیانوون بۆ کەمتەرخەمی. لەبەرئەوە لە بیریان بکەو کارە سەرەکییەکەت ئەنجام بدە.

٢٤- ئاگاداری سەلامەتیو باری تەندروستی خۆت بە.. چونکە تەنها بە لەشێکی ساغو گیانو هەستێکی تەواوو پێویستەوە.. دەتوانیت کارێك لە کاتی خۆیدا بە ئەنجام بگەیەنیت.

٢٥- هەوڵی بە هێزکردنی بیروهزرت بدە.. چونکە لە هەندێك بارودۆخدا، هۆکاری تەواوی کەمتەرخەمی لە بیرچوونەوەیە.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو خاڵانە.. دەبا چیدی وەك ئەو یاریزانانە نەبین.. کە لە خولەکی کۆتاییو کاتی زیادکراودا.. دەیانەوێت گۆڵی بردنەوەو خاڵی سەرکەوتن تۆمار بکەن.. ئەویش بە خۆماندووکردنێکی زۆرترو کاتێکی کەم.. کە زۆر جاریش هەوڵو تەقەلایان سەرناگرێتو بە دۆڕاویو دەستی بەتاڵەوە، یاریگە جێ دەهێڵن.. لە کاتێکدا ٩٠ خولەك دەرفەتیان لەبەر دەستدا بووە.. تا بە خەیاڵێکی ئاسودەو تەکنیكو پلانێکی تۆکمەوە.. بە بێ شپرزەبوون ئەنجامی پێویست بە دەست بهێنن.

دەبا ئیدی هەلە ڕەخساوو وادە ٩٠ خولەکییەکانی ژیانمان.. بە کەمتەرخەمیو لەبەرچەند خولەکێك کەیفو خۆشیی ماوە کورت، بە فیڕۆ نەدەینو ئەو کاتو دەرفەتانەی پێمان دراوە.. بە بێ هودە بەسەریان نەبەین.. مادام ناتوانین دەرفەتی گونجاو بۆ جێبەجێکردنی کارەکان بڕەخسێنین.. لەم بارەشەوە ئەم وتەیە بکە بە کرۆکی کارو ژیانت:

« تۆ کە چاوەڕێی هەلو دەرفەتی لە باریت.. چاك بزانە ژینت بۆ خۆی گەورەترین هەلو دەرفەتە، کە پێت بەخشراوە».

# شێرو خەت!!

لەسەروبەندی جەنگێکی گرنگو چارەنووسسازدا، سەرلەشکرێکی یابانی بڕیاری دا.. بە لەشکرە زۆرو زەوەندەکەیەوە هێرش بکاتە سەر دوژمن.

متمانەی زۆری بە خۆی هەبوو کە لە جەنگەکەدا سەرکەوتن بە دەست دەهێنێت، بەڵام سەربازەکانی لە سەرکەوتن، دوودڵو دڕدۆنگ بوون.

لەسەر ڕێگەی جەنگەکەیاندا لە پەرستگەیەك لایان دا.. پاش ئەوەی سەرلەشکر لەگەڵ سەربازەکانیدا نوێژی کرد.. دراوێکی ئاسنی دەرهێناو گوتی:

ئێستە من ئەم دراوە هەڵدەدەم، ئەگەر شێر دەرچوو.. ئەوا لەم جەنگەدا سەردەکەوین، بەڵام ئەگەر خەت دەرچوو.. ئەوا شکست دەهێنین.

چارەنووسی خۆی دەستنیشان کرد.. دراوی هەڵدا بۆ ئاسمانو هەمووان بە تامەزرۆییەوە تەماشایان دەکرد.. کاتێك دراوەکە کەوتەوە سەر زەوی، شێر دەرچوو.. ئیدی سەربازەکان دەنگی شادییان گەیشت بە تەشقی ئاسمان.. لە خۆشییاندا پێیان زەوی نەدەگرت.. بە تەواوەتی لە سەرکەوتنیان دڵنیابوون.. سەرەنجام بە گوڕو تینەوە، پەلاماری دوژمنیان داو سەرکەوتنیان بە دەستهێناو جەنگەکەیان بردەوە.

دوای کۆتاییهاتنی جەنگەکە، ئەفسەرێکی ناو لەشکرەکە.. لە سەرلەشکرەکەی پرسی:

قوربان.. جەنگێکی ئاوا چارەنووسساز، چۆن دەبێت بە شێرو خەت بسپێردرێت؟! ئایا شێرو خەت توانای گۆڕینی ئاکامی جەنگی هەیە؟!

سەرلەشکرەکە لە وەڵامیدا گوتی: هەق بە تۆیە.

پاشان دراوەکەی پیشانی ئەفسەرەکە دا.. بەڵام هەر دوو ڕووی دراوەکە...... شێر بوو!!

www.article.oxinads.com

# داهێنانی ڕێکخراوەیی

بەشی یەکەم

ئا: وەهاب حەسیب محەممەد

ئەو گۆڕانکارییە گەورانەی کە لە پێکهاتەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا لەم دواییانەدا ڕوویاندا، ڕەنگ دەداتەوە لە گەشەی ئابوری خێراو زیادبوونی دانیشتوانو گەیشتنی وڵاتانی تازەگەشەکردوو بە قۆناغی دروستکردن، (دروستکردنی شمەكو پێداویستییەکانیان)، ئەم گۆڕانکارییانە بە تەنها ئەنجامی کەڵەکەبوونی سەرمایەی یەکە ئابورییەکانو بەکارهێنانی تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو نییە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ باش بەکارهێنانی هێزی مرۆیی لەم یەکە ئابورییانەدا، تێبینی دەکرێت کارکەران ڕۆڵێکی گرنگو بەرچاو دەبینن لە پێشخستنی ڕێکخراوەکەو ئامانجەکانی، بۆیە پێشەوا کارگێڕییەکان بەدەر لە جیاوازی ئاستو پلەکانیان لە کاتی دامەزراندنی هێزی مرۆییدا کارئاسانی دەکەن بۆ هەڵبژاردنی کەسانی بە تواناو خاوەن ئەزموون، لەو باوەڕەدان هێزیی مرۆیی نوێ باشترین کەرەستەی ڕێکخراوەکەن، لێکۆڵینەوەو توێژینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە هێزی مرۆیی تازەو شێوازی بیرکردنەوەیان ئامرازی سەرەکی داهێنانن، ئامرازی گۆڕانکاریو باشکردنو پێشخستنن، دیارترین نموونە قوتابخانەی یابانییە، کە توانیوییەتی بە فەلسەفەو شێوازی تایبەت بە خۆی سەرچاوەی مرۆیی یابانی بنرخێنێتو لێی تێبگات، ئەمەش کاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە لە باڵا دەستی یابان لە بواری پیشەسازی لەسەر ئاستی جیهاندا، بازرگانی یابانی سوود لە هێزی مرۆیی بەردەستی وەردەگرێت کە سازکراوە بە زانستو تەکنیكو گیانی خۆنەویستانە لە کارکردندا لە ٦٦،٧٪ دانیشتوانی ئەو وڵاتە تەمەنیان لە نێوانی ١٥ بۆ ٦٥ساڵیدایە، ناردنە دەرەوەی وڵاتی یابان ڕێژەی ١٠،٥٪، هاوردەی ئەو وڵاتەش ٨،٩٪ی بازرگانی جیهان پێکدەهێنێتو سێیەم زلهێزی ئابوری گێتییە... لە کاتێکدا خاکەکەی بە بەردەوامی ڕووبەڕووی زەمین لەرزەو بارەشی تسونامی دەبێتەوە.

ڕێکخراوچییە؟ ڕێکخراو بریتییە لە یەکەیەکی کۆمەڵایەتی لە دووکەس، یان زیاتر پێکدێت، ئامانجێکی هاوبەشیان هەیەو تێدەکۆشن بۆ بەدیهێنانی، کەواتە خێزان، وەزارەت، زانکۆ، نەخۆشخانە... بریتین لە ڕێکخراو، لەم ڕێکخراوانەدا پیشەو بەڕێوەبردنی جیاواز هەیە، گرنگترین سەرچاوە لەم ڕێکخراوانەدا سەرچاوەی ئادەمیزادە، چونکە بە بێ ئەو سەرچاوەیە مەحاڵە سوود لە سەرچاوەکانی تر وەربگیرێت.

داهێنان چییە؟ هەندێك پێیان وایە داهێنان شتێکی نادیارەو ناکرێت توێژینەوەی بەشێوەیەکی سودمەندانە بۆ بکرێت، چونکە سەرچاوەی داهێنان هێزی دەرەکییەو ئادەمیزاد هیچ دەسەڵاتێکی بەسەرەوە نییە. ئەم ناساندنە هۆکاری بەربەستە لە تێگەیشتنی مرۆڤ لە تواناکانی خۆی، هەندێکی تر لایان وایە داهێنان جۆرێکە لە جادوو کەسانێکی کەم پەیی پێدەبەن، واتا داهێنان نهێنییەکە خەڵکانێکی کەم خاوەنی ئەم نهێنییەن، برێك داهێنان پەیوەست دەکەن بە شێتییەوە، کەسی داهێنەر پێویستە شتێکی نا ئاسایی تیادا بێتو ئەو مرۆڤانە داهێنان دەبەستنەوە بە پەشۆکانو تێکچوونی دەروونی، کەسی داهێنەر زۆرێك ناودارانی دنیا لە ژێر ئەم ناساندنەدا ڕیزبەندی دەکەن. لە ڕۆژگاری ڕابردوودا باوەڕیان وابوو کەسانی داهێنەر لە بواری هونەر، یاخود ئەدەبدا کەسانێکی ئاسایی نینو نازانن چیدەکەنو چۆن دەپەیڤن، چونکە هێزێکی دەرەکی ئەوان دەجوڵێنێتو سروشیان پێدەبەخشێت... هەرچی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە زانستییەکانی ئەم ڕۆژگارەیە پێچەوانەی ئەو ڕۆژگارەمان پێدەڵێن، بە واتایەکی تر هەموو کەس دەکرێت داهێنەر بێت، بە مەرجێك بزانێت ڕێگای تواناکانی دیاری بکاتو گەشەی پێبدات... واتە زانایەكو خوێندکارێكو کرێکارێك دەگونجێت داهێنەر بن، هەر یەك لە سنوری کارەکەی خۆیدا.

داهێنان واتە: دروستکردنی شتێکی نوێ، کە پێشتر بەو شێوەیە نەبووبێت.

داهێنان واتە: توانستی چارەسەری نوێ، بۆ ئەو ئاریشانەی دەخرێنە بەردەست.

داهێنان بریتییە: لە دۆزینەوەو وەرگرتنو جێبەجێکردنی بیرۆکەو کردارو بەرهەمو خزمەتگوزاری تازە.

داهێنان بریتییە: لە: بەکاربردنی [بەرایی] یەکەم جاری یەکێك لە چەمکەکان لە لایەن ڕێکخراوێکەوە کە سەر بە گروپێکی هاوشێوەی خۆیەتیو ئامانجەکانیان لە یەکەوە نزیکە.

واتە دۆزینەوەی پەیوەندی تازە لە نێوانی شتەکاندا. داهێنان بە یەکێك لە کۆڵەکەکانی پێشکەوتنی دنیای ئەمڕۆ دێتە ئەژمار، کە ڕۆڵی کاریگەرو دیاری هەیە لە پێشخستنی مرۆڤی هاوچەرخو ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەکانی ژیانو بەرەنگارییەکانی دوارۆژی. گرنگیدان بە داهێنان بە تایبەت لە ڕووی زانستی دەرونییەوە دەگەڕێتەوە بۆ دەیەی چوارەمو پێنجەمی سەدەی ڕابردوو. لە ڕۆژگاریی ئەمڕۆدا ئەو کۆمەڵگایانەی هەنگاوی خێرا دەنێن ڕووەو پێشکەوتن گرنگییەکی زۆر دەدەن بەم بوارە، بێگومان لەو کاروانەدا گەلەك چەڵەمەو ئاریشەی جۆرارو جۆر لە بەردەم پێشکەوتنی کۆمەڵگادا سەرهەڵدەدات، پێویستی بە چارەسەری داهێنەرانەو داهێنان هەیە.

# زەوی و هەور

ن: حەمدی هاشم حەسانین

و: محەممەد میرگەیی

ڕۆژێکیانو لەو کاتەی خۆر کەوتە پشت هەندێك هەورەوەو دیار نەما، چەند خولەکێکی پێ نەچوو، ئاسمان پڕبوو لە هەورو لەگەڵ زەوی دەستیانکرد بە قسەو گفتوگۆ:

هەور: من لە ئاسمان نیشتەجێم، تۆش ئەی زەوی هەرگیز ناتوانیت بگەیتە شوێنی من، منی هەور جوانو سپیم، تۆش ڕەشیو پڕی لە قوڕو لیتاو. من لە ئاسمان دەڕۆمو کەس ناتوانێت دەستم لێبدات، تۆش لە هەموو ساتێکدا دەکەویتە ژێر پێی خەڵك.

لە ناکاو لە ئاسماندا بروسکەو هەورە تریشقە ڕوویدا، باران لە ئاسمان بەخوڕ هاتە خوارەوە. لە چەند خولەکێکدا هەورەکان بزر بوونو دیار نەمان، خۆر سەر لە نوێ بە دیار کەوتەوە. لەو کاتەدا زەوی پێکەنیو گوتی:

ئەی هەورەکە، جارێکی تر هەست بە لەخۆبایی بوون نەکەیت... لەو کاتەی بروسکەو هەورە تریشقە هێرشی بۆ هێنایت، هیچت دەست نەکەوت پەنای بۆ ببەی جگە لە باوەشی من نەبێت، لە ئاسماندا نەماویت، بەڵکو ئێستا تۆ لەسەر زەویت، ئەو زەوییەی کە تۆ دەڵێیت ڕەشە، بەلام کاتێك باران باری، سەوزو جوانو پڕ بوو لە گوڵو گوڵزار... تۆش ئەی هەور کاتێك دەباریت، دەبیتە ڕووبارو خەڵکی لێت دەخۆنەوە، دارودرەختو گوڵەکانیش بە تۆوە گەورە دەبن.

دوای چەند ڕۆژێك هەندێ هەور بە ئاسماندا تێپەڕبوونو بەڕێزەوە بە زەوییان گوت:

وانەیەکی وەها لە تۆ فێربووین هەرگیز لە یادمان ناچێت... لە ئەمڕۆ بەدواوە ئیتر لە خۆبایی نابین.

# مامۆستا

عەبدولوەهاب شوانی

مامۆستاکەی خۆم خۆشدەوێ
من دەخوازم، هەر سەرکەوێ
دڵسۆزە بۆم، وەکو بابم
ڕێزی دەگرم، تاکو مابم
وانەکانم، باش دەخوێنم
تا نمرەی چاك، بەدەست بێنم
لە سەر کورسی، خۆم لاناچم
لە فەرمانی، قەت دەرناچم
چی! مامۆستا، پێمان بڵێ
گوێی بۆ دەگرم، دەڵێم: بەڵێ
گەر پرسی لێم، بۆ وەلامی
دەست هەڵئەبڕم، بە ئارامی
مامۆستاکەم، فێری کردم
لە نەزانین، دەری کردم
بە خوێندنو هەم بە نووسین
دەستی گرتم، تا بزانین
بە گوێی دەکەم، باش دەخوێنم
تا ئاواتم، بە دەست بێنم
لە پۆلەکەم، خۆی ڕابەرە
مامۆستاکەم، تاجی سەرە

و/ عادل شاسواری

# ئەو خوێندکارەی هەڵەی مامۆستاکەی سەلماند

## چیرۆکی سەرکەوتنی ئیان لیۆپۆلد (Ian Leopold)

ئیان لیۆپۆڵدی خوێندکار (Ian Leopold) لە زانکۆی هۆبێرتی ئەمریکی خۆی زۆر ماندووکرد لە کاتی ئامادەکردنی پڕۆژەی تەواوکردنی خوێندنەکەی لە بواری سیستمە ئابوورییە نوێیەکانی کەرتی سەرمایەگوزاری بۆ ساڵی (١٩٨٥-١٩٨٦)، پڕۆژەکەیشی لە فەلەکی بیرۆکەیەکدا دەسووڕایەوە بریتی بوو: لە بڵاوکردنەوەی ڕێنومایییەکی کڕینو گەڕان، پێکهاتوو لە ٤٤ لاپەڕەو ئاڕاستەکراو بە تەواوەتی بۆ خوێندکارانی زانکۆکان، بەو مەرجەی ئەو ڕێنومایییە بە خۆڕایی بە سەر ئەو خوێندکارانەدا دابەش بکرێتو قازانجەکەی لە ڕێی ڕیکلامی خاوەن ڕیکلامەکانەوە بێت. ئەو مامۆستا زانکۆییەی سەرپەرشتیی لێکۆڵینەوەکەی لیۆپۆڵدی دەکرد لەگەڵ ئەو بۆچوونە نەبوو کە مێشکی ئەو لاوە بچووکەی بۆ چووبوو، ئەوەش وای لێکرد لەوانەکەی خۆیدا بیخاتو ڕێگەی تەواوکردنی خوێندنی زانکۆی لێ ببەستێت.

لیۆپۆڵد بڕوای تەواوی هەبوو بەوەی کە توێژی لاوانی نێوان تەمەنی ١٨ ساڵان تا ٢٤ ساڵان تەرکیزی تەواویان ناخرێتەسەر لە لایەن خاوەن ڕیکلامەکانەوە، لەو پڕۆژەیەشدا ئەوەی دەبینی کە ئەو کەموکورتییەی بایەخدانی میدیایی چارەسەر بکات. ئامانجیشی ئەوەبوو کە ئەو ڕێنوما خوێندکارییەی دەیویست دەریبکات کۆمەڵێك زانیاریی تێدابێت کە لەبنەڕەتەوە ئاڕاستەی خوێندکارانی زانکۆکان کرابن، بەتایبەتیش ئەوانەی لەشارە زانکۆییەکاندا نیشتەجێن، (ڕەنگە ئەم بیرۆکەیە نامۆ بێت بۆ ئێمەی دانیشتووی وڵاتانی ڕۆژهەڵات، بەڵام ئەوەی سەردانی وڵاتانی دەرەوەی کردبێت زۆر بە باشی شارە زانکۆییەکانو ماڵەکانی خوێندکاران دەزانێت چین).

لەو سەردەمانەدا دانیشتووانی ئەو شارە زانکۆییانە تووشی دابڕانێکی ناوخۆیی هاتبوون بەرامبەر بە دنیای دەرەوەیان، جگە لەوەش پرۆگرامەکانی خوێندن تەواوی کاتی ئەوانی داگیر دەکردو بواری ئەوەیشی بۆ نەدەهێشتنەوە ڕۆژنامەکان بخوێننەوە، یان سەیری تەلەفزیۆن بکەن، ئەو توێژەی خوێندکارانە یەکەمین هەنگاوی خۆی دەنا بەرەو کڕینو پشت بە خۆبەستن، توێژەکەش لە خۆیدا توێژێکی بە کاربەرەو هیچ وابەستەییو ئەمەکێکی نییە بۆ بەرهەمهێنێکی دیاریکراو، بەڵکو بە ڕووی تاقیکردنەوەی هەموو بەرهەمەکاندا کراوەتەوە بەبێ ئەوەی هیچ بۆچوونێکی پێشوەختی بەرامبەریان هەبێت، هەڵبەتە توێژێکی لەو شێوەیەش کاڵوکرچ لە ڕووی بازاڕەوە هەموو بەرپرسێکی فرۆش خەونیان پێوە دەبینێت لە هەر جێگایەك بێت.

لە سەروو هەموو ئەوانەوە، ئەو کۆمپانیا، یان مارکە بازرگانییەی بتوانێت دڵی بە کاربەرێکی سەر بەو توێژە بە لای خۆیدا ڕابکێشێت، ئەوە بە کاربەرێك بۆ بەرهەمەکانی خۆی دەست دەکەوێت هەتا مردن، ئەمەش خەونی هەر دامەزراوەیەکە لە چەمکی فرۆشی سەرکەوتوو تێبگات.

دیسان بیرۆکەکەی لیۆپۆڵد پشتبەستوو لە ریکلامی ئاڕاستەکراو بۆ خوێندکاران لە شوێنی گردبوونەوەکەیاندا، وەك تابلۆی ڕاگەیاندنو بڵاوکراوە ناوخۆییەکان کە بەردەوام وادەی یارییەکانی داهاتوو، یان ئەنجامو نمرەکانی ساڵی ڕابردوویان بڵاودەکردەوە.

لیوپۆڵد دانیشت بۆ نووسینەوەی پلانی کاری پڕۆژەکەیو هەرچی لە مێشکیدا بوو خستییە سەر کاغەز، دوای تەواوبوونیش ناوی کامپوس کۆنسپتس (Campus Concepts)ی هەڵبژارد بۆ ئەو پڕۆژە

گریمانەکراوەی پلانی کاری بۆ دادەڕشت.

پاشان دایە دەستی ئەو مامۆستا زانکۆیییەی کە سەرپەرشتی پرۆژەی دەرچوونەکەی دەکرد. بیرۆکەکە نوێو بوێرانەو زۆر سەرنجڕاکێشو جوان بوو، بەڵام ئەو لاوە بە هەڵپەیەی لە خوێندن دواخستو بە هۆیەوە دەرنەچوو. مامۆستاکەی پێیوابوو بیرۆکەیەکی لەو جۆرە لە ژیانی پراکتیکیدا سەرکەوتوو نابێت. لیۆپۆڵد خۆی نەدا بەدەستەوە، چونکە لە ڕاستیدا ناچاربوو بمێنێتەوە تا لەو وانەیەدا دەربچێت کە تیایدا ماوەتەوە، هیچ کارێکیشی نەبوو لە هاویندا، وێڕای ئەوەش کە سەر لەبەری گیرفانی لە ٤٨ دۆلار تێپەڕی نەدەکرد، بەڵام بڕیاریدا پڕۆژەکەی جێبەجێ بکات. سووریش بوو لەسەر ئەوەی هەڵەی مامۆستاکەی بسەلمێنێت.

لیۆپۆڵد تیمی فرۆشتنەکەی لە ناو برادەرەکانی زانکۆیدا هەڵبژاردو بە سیستەمی دەڵاڵانە کاری پێدەکردن، واتە ڕێژەیەکی دیاریکراو لە قازانجەکان بەرامبەر بە فرۆشتنی ڕیکلامی ئەو کۆمپانیایانەی کە بەرهەمی ئاڕاستەکراویان هەیە بۆ خوێندکارانی زانکۆ. ئەو ڕیکلامانەشی خستە ناو ڕێنومای زانیارییەکانی تایبەت بەخوێندکاران (کە ناوی نابوو ڕێنومای نافەرمیی خوێندکاران)، هەموو ئەو شتانەشی تێدابوو کە ڕەنگە خوێندکارانی زانکۆ بایەخی پێبدەن، وەك کۆمەڵێك تێبینی بۆ ئەوانەی بەدوای کاردا دەگەڕێنو پێویستە لە کاتی چاوپێکەوتنەکانی کاردا ئاگاداری چ شتێك بنو کۆمەڵێك ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی حەزیان لە تەواوکردنی خوێندنە لە دەرەوەی وڵاتو چۆنییەتی مامەڵەکردنی خوێندکاران لەگەڵ ئەو گوشارانەی لەسەریانە بە هۆی چاوپێکەوتنەوە، یان بە هۆی تاقیکردنەوەوە.

دابەشکردنی یەکەمین ڕێنومای چاپکراو لە مانگی یەنایەری ساڵی ١٩٨٦دا بوو لە نزیك زانکۆی هۆبارت، ئیدی خوێندکاران دەستبەجێ خۆشیان ویست، خاوەن ڕیکلامەکانیش هیچیان بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێت کە ئەوانیش خۆشیان بووێت. کۆی داهاتی یەکەمین ژمارە گەیشتە ٢٠٠٠ دۆلار کە نیوەی ڕاستی قازانجی پوخت بوو، لیۆپۆڵد یەکێکی دامەزراند وەك بڵاوکەرەوەو دابەشکاری ڕێنوماکەو خۆی تەرخانکرد بۆ هەوڵدان لە پێناوی بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر لە بەڕێوەبردنی سەرمایەگوزاریدا (MBA)، دوو ساڵیش دوای ئەو دەستپێکردنە ڕێنومای خوێندکاران وەهای لێهات ٧٥ هەزار دۆلار داهاتی بوو، ئەوەش دوای ئەوەی کە پانتایی دابەشکردنەکەی فراوانترکردو وەهای لێکرد هەموو زانکۆکانی ئەمریکا بگرێتەوە.

لە ساڵی ١٩٩٠دا ئەو بیرۆکەیەی کە پێشوەخت حوکمی شکستخواردنی بەسەردا درا کۆی داهاتەکانی گەیشتە نزیکەی یەك چارەکەملیۆن دۆلاری ئەمریکی، ئیدی لیۆپۆڵد چاری نەما ئەوە نەبێت واز لە کارەکەی بهێنێت لە یەکێك لە کۆمپانیا بە ناوبانگەکانی دڵنیایی کە دوو ساڵی تەمەنی تیادا بە سەربردوو، بڕیاریدا لە شاری بالتیمۆرەوەو لە ساڵی ١٩٩١ەوە خۆی تەرخان بکات بۆ بەڕێوەبردنی ئەو پڕۆژە تازەیەی خۆی.

لە ساڵی ١٩٩٢دا ڕێنوماکەی خوێندکاران فراوانتربوو، وەهای لێهات خزمەتگوزاریی فرۆشی پێشکەش دەکردو چاودێری ڕەسمی بۆ یەکێتییەکانی چالاکییە وەرزشییەکانی خوێندکارانی زانکۆ ئەمریکییەکان پەیدا دەکرد. لە ساڵی ١٩٩٥دا ئەو کۆمپانیایە پاڵەوانێتییەکی تایبەت بە خۆی سازکرد کە هەموو خەڵاتەکانی دیاریی چاودێرە ڕەسمییەکان بوون، لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٦یشەوە کۆمپانیا زەبەلاحەکان خزانە ناو گۆڕەپانی ڕیکلامی ئاڕاستەکراو بۆ خوێندکاران، وەك Nikeو بیبسیو دوای ئەوانیش مایکرۆسۆفت.

لە ساڵی ١٩٩٨دا کۆی داهاتەکانی کۆمپانیاکە گەیشتە ١٠ ملیۆن دۆلار، هەروەك بوو بە دەروازەیەك بۆ گەیشتن بە نزیکەی ٣ ملیۆن خوێندکاری زانکۆی ئەمریکی، سنووری چالاکییەکانی کۆمپانیاکەش فراوانتر بوو، وای لێهات ڕیکلامو ڕاگەیاندنو بڵاوکردنەوەی فرۆشی دەگرتەوەو بیرۆکەکەش گوازرایەوە بۆ دەرەوەی وڵاتو کۆمپانیاکە کەوتە هەوڵی هێنانەڕیزی کۆمپانیاکانی دیکە بە لای خۆیدا تا بوو بە زەبەلاحێکی بازرگانیی وەها کە ناکرێت بە هەند وەرنەگیرێت.

کەس لەوە پەشیمان نەبووەتەوە کە:

هەموو توانای خۆی لە شتێکدا خەرجکردووە، بەڵام ئەوانە زۆرن کە پەشیمانن لە تەمەڵییان.

سەرچاوە: ٢٥ قصه نجاح، نووسینی: ڕەئوف شەبایك. (وەك مژدەیەك بۆ خوێنەرانی بەڕێز هەموو کتێبەکە کراوە بە کوردیو پشت بەخوا بەمزوانە پێی شاد دەبن).

## وانەی گرنگ لە بازرگانیدا

١- نهێنی سەرکەوتن لە بازرگانیدا.. لە توانای هێنانە پێش چاو، پێشبینیو متمانە بە خۆبووندا خۆی دەنوێنێت.. لای هیچ کەسێکیش شاراوە نییە کە چەندین کەس، بە دەستی خۆیان کۆتایی خۆیان نەخشاندووە.. ئەوەش لە ئەنجامی بێمتمانەیی لە بڕیاردان، یان خراپی مەزەندەکردنو پێشبینییەکانیانەوە.

٢- پێویستە لە کارو بازرگانییەکەتدا، هەروەها تەنانەت لە ژیانی ئاسایی ڕۆژانەشتدا بە هەڵوێست بیت.. هەر لەبەر ئەوەشە گوتراوە: گەر خاوەن هەڵوێست نەبیت.. ئەوا لە گشت هەڵوێستەکاندا سەرکەوتوو نابیت.

٣- پێداگریو دووبارە ڕوونکردنەوەی تێڕوانینو هەڵوێستت بۆ دەوروبەرت.. کارێکی زۆر گرنگە بۆ گەیاندنی پەیامو ئاشکراکردنی هەڵوێستت بۆ پەیڕەوانت.

٤- هیچ کەس بە کەم مەگرە.. چونکە ڕێی تێدەچێت لە هەر کەسێکەوە شتێك فێر بیت.

٥- لە کاتێکدا تۆ لە لوتکەدایتو کاتی دەست لە کارکێشانەوە دەگات.. دەست لە کار بکێشەرەوە.

# لێدوانەکانی کۆتلر لە بازاڕسازیدا

بەشی دووەم

هاژە شێروانی

### ئایا بە ئەنجامگەیاندنی قازانجدار هەیە لە بازاڕسازی؟

سەربارى بە ئەنجامگەياندنى كارە قازانجدارەكان، ئايا بە ئەنجامگەياندنى قازانجدار هەيە لە بازاڕسازيدا؟ مرۆڤ زۆر گوێبيستى هاوكێشە يەك لايەنەكان دەبێت كە بە سەركەوتنى بازاڕسازى هەژمار دەكرێت. لێرەدا نۆ خاڵ لەم هاوكێشانەى كە زۆر بەربلاون و پشت بەستوون بە يەك بيرۆكە One – Liner لە خوارەوە دەخەينە ڕوو:

١- قازانج بكە لە ڕێگاى كوالێتى بەرزەوە:

زۆربەى خەڵك هاوڕان لە سەرئەوەى كە كوالێتى نزم شتێكى خراپە بۆ كارە بازرگانييەكان، ئەو كڕيارانەى كە سووتاوى دەستى كوالێتى خراپن جارێكى تر ڕوو لە كۆمپانيا ناكەنەوەو بە خراپەش لەسەرى دەدوێن. بەڵام چى سەبارەت بە سەركەوتن لە ڕێگاى كوالێتى باش؟ لێرەدا چوار گرفت هەن:

يەكەم/ كوالێتى گەلێكماناى هەيە: ماناى چييە ئەگەر كۆمپانيايەك بانگەشەى كوالێتى بەرز بكات؟ ئايا ئەمە ماناى ئەوەيە كە ئۆتۆمبێلەكانيان كار دەكات بە ڕێگايەك كە پشتى پێ ببەسترێت؟ ئايا ماناى ئەوەيە كە خێراييەكەى زياترە؟ ئايا پارچەكانى دادەڕژێت بە ڕێژەيەكى كەمتر بە تێپەڕينى كات؟ كڕيارەكان گرنگى بە شت گەلێك دەدەن، هەر بۆيە دەبينين كە بانگەشەى كوالێتى بە دياريكردنى زياتر لە مانايەك هيچ ماناى نييە.

دووەم/ زۆربەى خەڵك ناتوانن كە تەحەكوم بە كوالێتى بەرهەم بكەن بە تەنها سەيركردنى: بير بكەرەوە لە كڕينى ئامێرى تەلەفزيۆن، كاتێك دەچيتە ناو كۆگاكانى (سيركت سيتى)و سەدان ئامێرى جياواز دەبينيت كە دەنگو ڕەنگ بە ڕوونى نمايش دەكەن، سەيرى هەندێك جۆرى بە ناوبانگى دەكەيت كە پێت باشترە لەوانى تر. كوالێتى ڕەنگ بەوانى تر دەچێت، لەوانەيە كە بۆكسى ئامێرەكان جياواز بن، بەڵام گوزارشت نين بە هيچ شتێكى تايبەت بە كوالێتى ئامێر، تۆ پرسيار لە نوێنەرى فرۆشتن ناكەيت كە ئامێرەكەت بۆ بكاتەوە تا كوالێتى پارچەكانى بپشكنى. لە كۆتاييداو بە باشترين گريمانەو ئەگەر تۆ بيرۆكەيەكى باشت لەسەر كوالێتييەكەى دەبێت بە بێ بوونى هيچ بەڵگەيەك لەسەرى.

سێيەم/ زۆربەى كۆمپانياكان هەوڵ دەدەن كە بە يەك بگەن لە كوالێتىو لە زۆربەى بازاڕەكانو كاتێكيش كە ئەمە ڕوودەدات ئەو كاتە كوالێتى نابێتە ئەو توخمەى كە هەڵبژاردنى جۆرى بەرهەم ديارى دەكات.

چوارەم/ هەندێك لە كۆمپانيا ناسراوەكان بە كوالێتى بەرز وەكو مۆتۆڕۆلا كاتێك كە ستايشى دەكرێت بە كوالێتييە خاوەن شەش توخمەكەى، بەڵام ئايا كڕيار هەيە بەو ئاستەى كە پێويستيان بەم كوالێتييە هەيەو ئامادەن كە نرخەكەى بدەن؟ ئەو تێچوونەش چەندە كە مۆتۆڕۆلا داويەتى بۆ گەيشتن بە كوالێتييەك بە شەش توخمى؟ لەوانەشە زياترى لەسەر بكەوێت بۆ ئەوەى بگات بە ئاستى كوالێتى بەرزتر.

٢- قازانج بكە لە ڕێگاى باشترين خزمەت:

هەمووومان خزمەتێكى باشمان دەوێت. بەڵام كڕيارەكان بە ڕێگاى جياواز دەيناسن بۆ نموونە خزمەتكردن لە چێشتخانە، هەندێك كڕيار دەيانەوێت كە (گارسۆن)ەكە خێرا بێتو داواكارييەكانيان تۆمار بكاتو خواردنەكەيان بە خێرايى بۆ بهێنێت. كڕيارى تر هەست دەكەن كە ئەم خزمەتكردنە خێرايە واتا خێرا دەرچوونيان لەم شوێنە كاتێك ئەوان دەيانەوێت چێژ لەم ئێوارە خوانە وەربگرن. هەر بۆيە كە دەتوانين خزمەت دابەش بكەينە سەر چوار جۆر: خێرا، زيرەكى، زانين، چارەسەرى گرفتەكان، بەم شێوەيە هەر كەسێك فورسايى جياواز لە كاتى جياوازو ڕەفتارى جياواز دەكات سەبارەت بە هەر توخمێكيان، بانگەشەكردنيش بۆ پێشكەشكردنى باشترين خزمەت بەس نييە.

٣- قازانج بكە لە ڕێگاى نرخى كەمتر:

ستراتيژيەتىكەمترين نرخسەركەوتنى بۆ گەلێك دامەزراو دەستەبەركرد، كە

تیایاندا گەورەترین کۆمپانیا بۆ فرۆشتنی کەلو پەلی وەك: أيكيا، گەورەترین کۆمپانیاش لە جیهان بۆ فرۆشتنی کالای تاك (ۆوڵ مارت)، یەکێك لە کۆمپانیا هەرە قازانج کردووەکانیش (ساوپ أیست)ە، سەرەڕای ئەمەش پێشەوایانی نرخی کەم هەر دەبێت بە ئاگابن، لەوانەیە بە کتو پڕی کارگەیەك بێتە ناو بازاڕ بە نرخی کەمتر، هەروەك کۆمپانیای سیرز ماوەیەکی درێژخایەن نرخی کەمی پیادەکرد تا ئەو کاتەی کۆمپانیای (ۆوڵ مارت) سەرکەوت لە نرخی کەمدا. هەروەها نرخی کەمیش بە تەنها بەس نییە بۆ دامەزراندنی کارێکی وەبەرهێنان. چونکە کۆمپانیای (یوفو) بۆ ئۆتۆمبێل نرخەکانی کەم بوون، هەروەها کوالێتییەکەشی نزم بوو هەر بۆیە ونبوو! لەبەرئەوە پێویستە کە پێوەرێك هەبێت بۆ کوالێتیو خزمەت تاوەکو کڕیار هەست بکات کە شتێك دەکڕێت کە بەهایەکی هەیە نەوەکو تەنها نرخ.

٤- قازانج بکە لە ڕێگای گەورەترین پشك لە بازاڕ:

بە شێوەیەکی گشتی، پێشەوایانی پشکی گەورە لە بازاڕ قازانجی زیاتر دەکەن لە ڕکابەرەکانیان، چونکە ئەوان دەناسرێنەوە بە ئابوورییەکانی قەبارەو هەڵسەنگاندنی نیشانەی بازرگانی ناسراو. دەبینین کە (Band wagon effect) بۆ یەکەم جار متمانەی دابین کرد بۆ وەبەرهێنەرانی لە هەڵبژاردنی بەرهەمەکانی کۆمپانیا. لە هەمان کاتدا زۆرێك لە کۆمپانیا پێشەواکان لە پشکی بازاڕ قازانج ناکەن. هەروەك دەبینین کە کۆمپانیای (A & P) گەورەترین زنجیرەیە لە بازاڕی ناوەندی لە ئەمریکاو بۆماوەی چەند ساڵێك. کەچی قازانجی زۆر کەم بوو کە جێگای شەرمکردن بوو، کەواتە بیر بکەرەوە لە کۆمپانیا زلهێزەکانی وەك IBMو سیرز، جەنەراڵ مۆتۆرز، لە ساڵانی هەشتاکان کە ئەو کاتە ئەدایان دوو هێندەی زۆرێك لە ڕکابەرەکانیان بوو کە لە قەبارەدا بچووکتر بوون.

٥- قازانج بکە لە ڕێگای گونجانو گشتاندنی بەرهەم بە گوێرەی پێداویستی کڕیار:

زۆرێك لە کڕیاران ئەوەیان لە فرۆشیار دەوێت کە بەرهەمەکانیان دیزاین بکرێت بە جۆرێك کە هەندێك شێوە، یا خزمەتگوزاری تیا بێت کە پێویستیانە، لەوانەیە کارگەیەك بیەوێت کە لە بری کاتژمێر حەوتی ئێوارە، کاتژمێر پێنجی ئێوارە پۆستەکەی لە فیدراڵ ئێکسپرێس (پۆستەی خێرا) وەربگرێت. یا لەوانەیە گەشتیارێك بیەوێت کە ژوورێك لە ئوتێل بۆ بەشێك لە ڕۆژەکەی بە کرێ بگرێت، دابینکردنی ئەم پێداویستییانە لەوانەیە هەلو دەرفەت بدات بە فرۆشیار، بە هەر حاڵ لەوانەیە کە تێچوون سەبارەت بە فرۆشیار ئەوەندە بەرز بێت کە ناتوانێت خستنە ڕووەکە دیزاین بکات بە گوێرەی ئارەزووی کڕیار. لەوانەشە کە دیزاینەکە سەرکەوتوو بێت بە گوێرەی ئارەزووی کڕیار لە هەندێك کۆمپانیا، بەلام لە لای هەندێك کۆمپانیای تر دەبینین کە ستراتیژییەتی قازانجدار نین.

٦- قازانج بکە لە ڕێگای پەرەپێدانی بەردەوامی بەرهەم:

لێرەدا پەرەپێدانی بەردەوامی بەرهەم ستراتیژیەتێکی مەعقولە بە تایبەتی ئەگەر کۆمپانیا توانی کە پێشەوا بێت لە پەرەپێدانی بەرهەم، بەلام هەموو پەرەپێدانێکی بەرهەم قبوڵکراوو قازانجدار نییە، ئایا کڕیار چەند دەدات؟ ئەگەر بیستیان کە پاککەرەوەیەکی باشتر، یا ئامێرێکی ڕیش تاشینی تیژتر، یا ئۆتۆمبێلی خێراتر هەیە؟ هەندێك بەرهەم دەگاتە ئەوپەڕی ئەگەری پەرەپێدانی، هەر بۆیە پەرەپێدانی کۆتایی کاریگەری زۆر نییە.

٧- قازانج بکە لە ڕێگای داهێنانکردن لە بەرهەمدا:

وتەیەکی باو هەیە کە دەڵێت: «داهێنان بکە، یاخود ون بە» ئەمەیان ڕاستە، هەندێك کۆمپانیای گەورەی داهێنەر هەن وەکو: سۆنیو 3M کە قازانجی زۆر گەورەیان کردووە بە داهێنان لە بەرهەمە نوێیە جوانەکانیان. بەلام کۆمپانیای ئاسایی زۆر سەرکەوتوو نەبوو لە پێشکەشکردنی بەرهەمی نوێدا، کە ڕێژەی هەرەسهێنانی لە بەرهەمی نوێی تایبەت بە کالای بەکارهێنەری داخراو ٨٠٪یەو بواری کالای دروستکراویش نزیکەی ٣٠٪یە، گرفتی لە پێشکەشکردنی بەرهەمی نوێ کە لەوانەیە ون بێت، ئەگەر داهێنانت لە بەرهەمی نوێ کرد ئەوا لەوانەیە کە دارایيەکی زۆر زیان بکات.

٨- قازانج بکە لە ڕێگای چوونە ناو بازاڕێك کە خاوەن گەشەکردنێکی بەرزە:

بازاڕی خاوەن گەشەی ئاست بەرز ڕوانینەکان بۆ خۆی دەدزێت، وەکو بازاڕی ئەلیکترۆنیاتو ڕۆبۆتو گەیاندن لە دوور، کە هەندێك لە کۆمپانیا پێشەواکان قازانجی گەورەیان کردووە لەم پیشەسازییانە. ئەمەو جگە لەوەی کە کارگەی ئاسایی لەوانەیە زیان بکات ئەگەر هاتوو چووە نێو بواری بازاڕێك کە خاوەن گەشەکردنێکی ئاست بەرزە، لەوانەیە سەد کارگەی نوێ هەبن کە پڕۆگرامی کۆمپیوتەری وێنەکێشان بەرهەم بهێنن کەچی ژمارەیەکی کەمیان بەردەوام دەبێت. ئەگەر هاتوو بازاڕ بەرهەمێکی نوێی وەرگرت بە ڕێژەیەکی گشتی، ئەوا کۆمپانیای بەرهەمهێنەر دەست دەکات بە چێژوەرگرتن لە قەبارە گەورەکەی داهاتی دارایيەکەی. هەر بۆیە دەبینین کە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت بوو بە ڕێچکەیەکی پێشەوا لە کاتێکدا کە هەڵبژاردنی باشتری خستە لاوە، گرفتێکی تر ئەوەیە کە بەرهەمەکان بێ سوود دەبن (کۆن دەبن) زۆر بەخێرایی لە بازاڕە خێرا گەشەکردووەکان هەر بۆیە پێویستە لەسەر هەموو کۆمپانیایەکی بەرهەمهێنەر کە دارایيەکەی وەبەربهێنێت بە بەردەوامی بۆ گەیشتن بە کۆمپانیاکانی تر، بە حاڵ دەتوانێت کە قازانج بکات لە بەرهەمێکی تری نیشاندراو بەر لەوەی کە بەردەوام بێت لە پەرەپێدانی، یان گۆڕینی بە بەرهەمێکی تر.

٩- قازانج بکە لە ڕێگای بە پێشکەوتنی پێشبینییەکانی کڕیار:

یەکێك لە کلێشەکانی ڕیکلامکردن کە زۆر باوە لە بازاڕسازیدا دەڵێت: کۆمپانیای قازانجکردوو ئەو کۆمپانیایەیە کە بە پێشکەوتنی پێشبینییەکانی کڕیارو تەنها پڕکردنەوەی پێشبینی کڕیاریش ڕەزامەندییان دەستدەخات، هەرچی بە پێشکەوتنی پێشبینیانە ئەوا دڵخۆشیان دەکات، ئەو کڕیارانەی کە لە گەڵ دابینکەرانیان دڵخۆشن ئەوا ئەگەری مانەوەیان لە گەڵیدا زیاترە. گرفتیش لە پێشکەوتنی پێشبینی کڕیارەکان وا دەکات کە پێشبینی گەورەتر داواکەن لە چاو جاری پێشوو، ئەم پرۆسەیەش ئاستەم دەبێتو تێچوونیشی زیاتر، هەر بۆیە پێویستە لە سەر کۆمپانیا کە قەناعەت بکات بە پڕکردنەوەیەکی تر لە تەنها پێشبینییەکانی.

با بە شێوازێك ڕوونی بکەینەوە، زۆربەی کڕیارەکانی ئەمڕۆ بەرزترین ئاستی کوالێتیو خزمەتو حەسانەوەو دیزاینی بەرهەمیان دەوێت بە گوێرەی پێداویستیانو ناسینەوە سەربارەکانو گرەنتییەکان، ئەمانەش هەمووی بە کەمترین نرخ، لەسەر هەر کۆمپانیایەك پێویستە کە بڕیار بدات کام لەم ئارەزووە جۆراوجۆرانەی کڕیار دەتوانێت کە بەس بێت بۆ گەیشتن بە ڕێگایەکی قازانجدار؟

بەشی دووەم و کۆتایی

# داهێنان.. ڕێگەت بەرەو سەرکردایەتی دوارۆژ

و/ پشتیوان مبارك كەریم

گەیشتین بە جێبەجێکردنێکی زانستییانە.. چۆنیش بیرۆکەو چارەسەری نوێ دابهێنین.. بۆ ئەم مەبەستە ئەم شێوازانە دەخەینە ڕوو:

١- ئامانجێکی ڕوونو ئاشکرا، بۆ داهێنانو بیرکردنەوەت دیاری بکە.

٢- بیرکردنەوە بە پێچەوانەوە، یاخود بە هەڵگەڕاوەیی.. واتە؛ ئەوەی لە ژیانتدا دەیبینیت، پێچەوانەی بکەرەوە، یاخود هەڵیبگەڕێنەرەوە.. تا بیرۆکەیەکی نوێت لە لا دروست دەبێت. بۆ نموونە: (فوتابیان دەڕۆن بۆ فوتابخانە). کاتێك پێچەوانەی دەکەیتەوە، دەڵێیت: (فوتابخانە دێت بۆ لای فوتابیان). ئەمەش لە ڕێی خوێندن لە ئینتەرنێتدا، ڕووی دا.

٣- تێکەڵکردن.. واتە تێکەڵکردنی دوو ڕەگەز، یان زۆرتر، بۆ گەیشتن بە داهێنانێکی نوێ. بۆ نموونە: ئۆتۆمبێل+ بەلەم= ئۆتۆمبێلی وشکاوەکی. ئەم بیرۆکەیەش جێبەجێکرا!

٤- سڕینەوە.. بەشێك، یان هەنگاوێك، لە دەزگایەك، یان لە ڕژێمێکی کارگێڕیدا بسڕەوە.. بە مەرجێك ئەو بەشە بێ سوود بێت.

٥- داهێنان بە خەونو خەیاڵ.. بۆ نموونە: وا بزانە تۆ، لە وەزارەتی پەروەردەو فێرکردن، بوویت بە بەڕێوەبەرێك.. ئەوکات چی دەکەیت؟ یان وا بزانە، ئێمە لە ژێر ئاودا دەژین.. ئەوسا ژینمان چۆن دەبێت؟

٦- کارتێکەرە هەرەمەکییەکان.. سەردانی دووکانێکی یاریی منداڵان بکە.. یان گەشت بکە بۆ وڵاتێك، کە پێشتر سەردانت نەکردووە.. یان بە شوێنێکدا بگەڕێ، کە پێشتر سەردانت نەکردبێت. لە بیریشت نەچێت.. دەفتەرێکی تێبینی لەگەڵ خۆتدا هەڵبگرەو با قەڵەمێکیشت پێ بێت.. تا هەر بیرۆکەیەك، یان یادەوەرییەك.. کە بە مێشکتدا دێت، تۆماری بکەیت.

٧- داهێنان بە گواستنەوە.. واتە: گۆڕینو گواستنەوەی بیرۆکەیەك کە وا دیارە نادروستە، یان ناپەسەندە.. بۆ بیرۆکەیەکی پەسەند.

٨- گۆشە نیگایەکی دیکە.. لە لایەنی دووەم، یاخود سێیەمەوە، سەیری گرفتەکە، یاخود داهێنانەکە، یاخود بابەتەکە بکە.. تێڕوانینت لە مەودای بینینی خۆتدا قەتیس مەکە.

٩- چی دەبێت ئەگەر بە خۆت بڵێی: چی دەبێت ئەگەر ئاواو ئاوا ڕوو بدات؟ ئەوا ئەنجامەکەی دەبێت بە...

١٠- چۆن دەبێت؟ ئەم پرسیارە بۆ دۆزینەوەی چەند وەڵامو ڕێگەچارەیەك، بە کاربهێنە.

١١- بەکارهێنانەکانی دیکە.. ئایا دەتوانیت (٢٠) بەکارهێنانی دیکە- جگە لە نووسینو وێنەکێشان- بۆ قەڵەم بدۆزیتەوە؟ ئەم شێوازە تاقی بکەرەوە.. بە دڵنیاییەوە دەگەیت بە بیرۆکە بە سوودەکان.

١٢- بە بەردەوامی پەرە بسێنەو لە هیچ شتێکدا، لە پەرەسەندنو گۆڕانکاریدا، مەوەستە.

چەند نموونەیەکو جێبەجێکردنیان:

١- وا بزانە دامەزراوەکەت بڕیاریدا.. تۆ لە کارەکەت دەربکات.. چی دەکەیت؟ ئایا بە شوێن کارێکی دیکەدا دەگەڕێیت؟ یان پرۆژە تایبەتییەکەت دەست پێ دەکەیت؟ یان هیچ شتێك ناکەیت؟

بیربکەرەوەو بیرۆکەیەکی داهێنەرانەی نوێ دابهێنەو جێبەجێی بکە. لە بیرت بێت.. ترسان لە نانبڕین، کۆسپێکی بەردەم داهێنانە.

٢- تەماشای ئەو شمەکو کەلوپەلانەیماڵەوە بکە.. کە پەراوێز خراون، یان فەرامۆش کراون. ئایا دەتوانیت سوودیان لێ وەربگریت؟ لەسەر مێزەکەم قوتوویەکی

تێدایـــە، بۆ قەڵەم دانان. ئــەم قوتووە لە بنەڕەتـــدا قوتـــووی خواردەمەنـــی بووە.. بـــەڵام پاککراوەتـــەوەو ڕازێنراوەتەوە.. تا جوانو بەسوود بووە.

٣- پێت خۆشـــە لەگەڵ خێزانەکەتدا، بۆ گەشـــتێکی داهێنەرانـــە بچیت.. کەواتە ئەم گەشتە چۆن دەبێت؟

٤- ژوورەکـــەت شـــێواوە.. چـــۆن بـــە جۆرێـــك ڕێکی دەخەیتەوە کە ڕووبەرێکی فراوانی لێ بمینێتەوەو ئەم ڕێکخستنەش کردارییانە بێت.

٥- هەندێك لە هاورێکانت ســـەردانت دەکـــەن بۆ ماڵـــەوە، چۆن بـــە ڕێگەیەکی داهێنەرانە پێشوازییان لێ دەکەیت؟

٦- حەزت کرد ئەندامانی خێزانەکەت، بە چالاکییەکی داهێنەرانە چالاك بکەیت، ئەم چالاکییە چۆن دەبێت؟

٧- بڕیاری ڕوواندنی ڕووەکی جوانیت لـــە ماڵەکەتـــدا دا، چـــۆن دەیڕوێنیـــتو شێوەکەی چۆن دەبێت؟

٨- سەرنجت دا خەرجی ماڵەکەت زۆرە، چۆن ئەم خەرجییە کەم دەکەیتەوە؟

٩- دەتەوێـــت ســـامانی زانیاریت زیاد بکەیت، زیاتر فێر ببیتو زیاتر بزانیت، بۆ زیادکردنی زانیاریت، (١٠) شێواز دابهێنە.

١٠- ئەگەر لە ئیشوکارەکانی ماڵەوەدا، پشـــت بە خزمەتکار دەبەستیت.. وا بزانە بۆ ماوەی هەفتەیەك وازت لێی هێنا، چۆن ئیـــشو کاری ماڵەکەت بـــە ڕێ دەکەیت؟ ئەم ڕاهێنانەش بە شـــێوەیەکی کردارییانە جێبەجێ بکەو وازیش لە خزمەتکارەکەو کەموکورتییەکانی خزمەتگوزاری بهێنە.

دوائەنجام/

کەســـێکی داهێنەربـــەو گـــوێ مـــەدە بـــەوەی خەڵکی دیکـــە دەیڵێن لە قســـەو قســـەڵۆکی خراپو ڕەشـــبینانە. هەوڵ بدە بەهـــرەی داهێنەرانـــە لـــە خۆتدا گەشـــە پـــێ بدەیـــتو بزانـــە ئـــەوە بەهرەیەکە دەتوانیت بە دەســـتی بهێنیـــت.. هەروەها داهێنـــان بـــۆ ژیانی تـــاك، گەشـــەپێدانی بەهـــرەو زانیارییـــەکان، بۆ تێکشـــکاندنی ڕۆتینو بێزاری، بۆ گەشـــەپێدانی بەهرەو زانیارییەکان، بـــۆ دەوڵەمەندکردنی ژیانی بە ئەزموونو هەڵوێســـتی جوان پێویستە.. لەبەرئەوە لە هەموو ژینی تایبەتیت بیر بکـــەرەوەو هـــەوڵ بدە لە گشـــت بوارێکدا داهێنان بکەیت، هەرچەندە کەمیش بێت.

ســـەرچاوە/ ١- سلسله الإبداع والتفكير الابتكاري: د.علی الحمادی

٢- الخـــروج مـــن الصنـــدوق: فرانـــك بارنس. ترجمە: نسیم الصمادی

# هاتووم... بمێنمەوە

ئاسۆ حاجی

ئەی خوایە گیان، دەبێت ئەو کۆلکەدارە بە جێماوە هی ئەو درەختە بێت، کە دوێنی لە قەدپاڵیدا هێلانەم تیادا دروســـتکردبوو، لەســـەر لقەکانـــی گۆرانی جوانی سروشـــتم بـــە خۆشـــترین ئـــاواز دەخوێنـــد، دەبێـــت ئـــەوە ئەو درەختە بێت، کـــە ڕوژانێك بوو ڕێبـــوارە ماندووەکانی ڕێگا بڕیوی ســـەخت و دووورودرێژە بێســـێبەرەکان دەهاتن تاوێك لـــە ژێرســـێیبەری بـــاڵاو گـــەڵای لقەکانیدا سەرخەوێکیان دەشـــکاندو چەند خەونێکی نەهاتنەدییان بە هیـــوای داهاتوویان دەدی؟ ئەوە ئەو درەختەیە کـــە جێگای ڕازونیازی هاوسەران بوو، ڕازی دڵی خۆیان بۆ یەکدی دەکردەوەو نەخشەی داهاتوویان دادەڕشت؟

ئـــەوە ئـــەو درەختەیـــە، کـــە مندالە بێنازەکان دەهاتن پەت و گوریســـەکانیان لە لقـــەکان دەبەســـت و جۆلانەیان لێدە کـــرد؟ گەڵاکانیـــش لەگـــەڵ پێکەنینـــە ڕاســـتگۆییەکانیان دەکەوتنە سەما، هێدی هێدی بۆ ســـەر زەوی نـــەوی دەبوون و بە ئەســـپایی ماچیـــان دەکردن، لـــە ژێر پێی منداڵان ئـــارام و هێمن بـــێ گلەیی بوون، دەیـــان گـــوت: نەبـــادا لەســـەر جۆلانەکە بەرببنـــەوەو ئازاریان پێبگات، با لەســـەر یەك و با لە یەك کەڵەکە بین تا شوێنێکی نەرم دروست بکەین بۆیان.

بـــەڵام... بـــەڵام ئاخ... بەڵام ئاخ.. ئێســـتا بۆچی وات بەسەرهاتووەو قڵیشاوو بڕاوەیت.

بێبەزن و بێباڵای، دیارە ئەوانە وەفاو نرخـــی جوانی تۆیان نەزانیـــوە، بەڵکو بۆ خۆشـــبەختی دڵی خۆیان هاتـــوون تۆیان داوەتـــە بەردەمـــی تەورەتیژەکانیـــان، بۆ ڕازاندنـــەوەی دەرگاو پەنجەرەو پەرژینی کۆشـــك و تەلارەکانیـــان بـــۆ ســـێبەری کەپرو ســـاباتەکانیان تۆیـــان واڵێکردووەو منیشـــیان بێلانە لەم دارستانەی دوێنێ و خاپوورستانەی ئەمڕۆ هێشتەوە.

بمبـــورە مـــن نەمزانـــی بـــوو، ئـــاگام لێنەبـــوو، من هاتـــم پیرۆزبایی ســـاڵێکی نوێی تەمەنـــت لێبکەم دوعای درێژبوونی تەمەنـــت بۆ بکەم، گۆرانییەکی نوێتر بە ئاوازێکـــی دڵڕفێـــن بۆ تەمەنـــت بخوێنم، بەڵام کە هاتم چیم دی، چی ببینم، تەنها لاشـــەیەکی ساردو سڕی بێ لق و بێ گەڵاو بێ ســـێبەر.... چیبکەم گیانەکەم، چیم لە دەست دێت بۆ تۆی بکەم؟!

ئـــای خودایەگیـــان دەمەوێت بگریم، پـــڕ بە دنیا هاوار بکەم، هاوار بکەم بڵێم: بۆچـــی وا بێبەزەییـــن؟ بـــۆ وا ڕقتـــان لە سروشت و جوانی سروشتە بۆ... بۆ؟؟

ئـــاخ چـــی بکەم دڵـــم زۆر بـــە ئازارە ئێجگار بێئارامە.. گیانەکەم زۆر دەترســـم لە هەموو شتێك و لە هەموو کەسێك...

خوایەگیـــان دەبێـــت باڵندەکانـــی تـــر بۆ کـــوێ چووبن، بـــەرەو کام لـــق، لە کوێ جارێکی تر هێلانە دروست بکەنەوە، دەبێت پرسەیان لە کوێ دانابێت... من ڕوو لە کوێ بکەم، سەریخۆم بۆ کوێ هەلگرم؟

ئـــاخ چەند مانـــدووم، چەند هیلاکم، بەڵام هەر دەبێت بگەڕێم تا بیان دۆزمەوە، خۆ بە تەنیا لەم خاپوورستانە نامێنمەوە، توخـــوا ئێـــوەش بگەڕێـــن بـــا بـــە تەنیا نەمێنمەوە... با بە تەنیا ســـەر نەنێمەوە، چونکە هاتووم تا بمێنمەوە.

# پەرداخە ئاوەکەی پاشا

بەشی سێیەم

ئاوارە عەلی مستەفا

مرۆڤەکان بە سروشت هەندێکیان تەندروستو هەندێکیان چرچ و چرووساوەو پەژمووردەن، بۆ ئەوەی لە یەك جیا بکرێنەوە دەبێت لە نۆرینگەو تاقیگەی ژیان پشکنینیان بۆ ئەنجام بدرێت، مرۆڤە تەندروستو بیرمەندەکان هەمیشە دەژین بۆئەوەی سەرکەون، هەوڵدەدەن تائەوەی ژین دروست بکەن، ماندوو دەبن بۆئەوەی دواتر پشوو بدەن، دەخوێنن تا فێرببن، دەخوێننەوە تا نووسەر بن، دەشنووسن تا ئەوەی بەخشندە بن، دڵخۆش دەبن بۆئەوەی خەندە بچێتە لێواری لێوەکانیان، فرمێسك دەڕێژن تا ئاسوودەبن، بیر دەکەنەوە تاوەکو نەکەونە هەڵەوە، کە قسە دەکەن بە سوودن، کە بێدەنگن بەڕێزن، بوونیان خەلاتێکی خواییە بۆ جیهانیان، کەشتی گەردوون بەبێ بوونی ئەوان دەکەوێتە بەر تەوژمو شەپۆلە سەختو دژوارەکانی ژیانو لە دەریای نەزانیو فامکاڵیدا نغرۆ دەبێت، ئیدی حزوریان وەك ئەو چوارچێوەو مەرکانە وایە کە گوڵدانی ژیان بە نەبوونی ناوازەییو بەرچاوی خۆی دەدۆڕێنێت.

بەلام مرۆڤە نەخۆشەکان دەژین تاوەکو نەمرن، هەوڵدەدەن تاکوو بژین، پشوو نادەن، چونکە هەمیشە ماندوون، فێرنابن، چوونکە ناخوێنن، ناخوێننەوە چونکە خوێندەوار نین، ناشنوسن چونکە کەودەنو بێ بەرهەمن، پێناکەنن چونکە خەمۆکن، دەگرین چونکە لاوازن، هەمیشە هەڵەن چونکە بیرناکەنەوە، کە قسە دەکەن بێسوودن، چونکە گوێگریان نییە، کە بێدەنگن بوونیان نییە، چونکە کەسێتیو سەنگیان نییە، کە هەن کێشەن، کە نین هیچن، بە بوونیان گەردوون گیرۆدەی ئەستۆك بوونو کوشتەی بە کتریای نەزانیو ئاریشەکانی ئەوان دەبێت، ئیدی بوونیان دەبێتە ئەو پەڵە ڕەشەی نیگاری گوڵدانی ژیان دەشێوێنێت.

دەگێڕنەوە کە جارێکیان (ئیبن سەماك) دەچێتە لای هاروونە ڕەشید، لەو کاتەدا هارونە ڕەشید تینووی دەبێتو داوای ئاو دەکات، ئیبن سەماکیش پێی دەڵێت: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر لە خواردنەوەی ئەم قومە ئاوە قەدەغەت بکەنو نەهێڵن بیخۆیتەوە، ئایا لە بەرامبەر خواردنەوەیدا نیوەی ماڵو سامانەکەت دەبەخشیت؟ هاروونە ڕەشید وتی: بەڵێ.

کاتێك هاروونە ڕەشید ئاوەکەی خواردەوە ئیبن سەماك پێی وت: ئەی خەلیفەی باوەڕداران ئەی ئەگەر نەهێڵن ئەو قومە ئاوەی کە نۆشیت لە ناو لاشەت بێتە دەرەوە، ئایا نیوەی ماڵی خۆت دەبەخشیت بۆئەوەی بێتە دەرەوە؟ هاروونە ڕەشید وتی: بەڵێ، ئیبن سەماکیش فەرمووی دەی کەواتە خێرو بەرەکەت لە سامانو داراییەکدا نییە کە نرخو بەهای قومێك ئاوی نەبێتو مرۆڤ لە پێناو دڵۆپە ئاوێکدا سەرتاپای ببەخشێت!

## گوڵدانی عەشق

چیرۆکانی ئەم جارەی گوڵدانەکەمان بریتییە لە:

١- لە نەبوونی سامانو داراییدا، عەقڵ دەتوانێت کامەرانی دروست بکات، بەلام مەحاڵە سامانو دارایی بتوانن لە نەبوونی عەقڵدا خۆشبەختیو ئاسوودەیی فەراهەم بکەن.

٢- بەختەوەریو سەرکەوتن لە بەگەڕخستنی ئەو خانە عەقڵیانەیە کە بەدیهێنەری مەزن بە تۆی بەخشیووە، تەنانەت لە تێڕامانی چڕو بابەتیانەت بۆ بارودۆخو ڕووداوەکان دەگەیتە ئەو بڕوایەی کە ئەو پارەو سامانەی خەڵکی بەسەرچاوەی ئاسودەیی دەزانن تۆ لە بەراوردێکی ژیرانەدا تەنهاو تەنها بەهای پەرداخێك ئاوی بۆ هەژمار بکەیت.

٣- دەشێت بڵێین مرۆڤە نا تەندروستو عەقڵ دۆگماوەکان لە مەڕ ئاریشەو کێشە بچووکەکاندا تەنانەت بە هەموو داراییو هەبوونییەوە خۆیان کڕنووش بۆ شکست دەبەنو تەسلیم دەبن، بەلام بێ خەوشو تەندروستەکان قەبارەی کێشەو لەمپەرەکان بچوکتر دەبینن لەوەی کە هەن، ئەمەش لە دەرەنجامی عەقڵ کراوەییو دڵفراوانیاندا، وەکو بیستت هاروونە ڕەشید لە بەرامبەر تەنها قومێك ئاودا ئامادەی بەخشینی تەواوی ماڵەکەی بوو، بەلام پیاوە زاناکە هەموو سامانی خەلیفەی بە نرخی پەرداخێك ئاو بەراورد کرد.

٤- هۆشمەندەکان سامانو پارەوپوول جگە لە ئالییەتو وەسیلەیەك بۆ گوزەرانێکی ئاسودە زیاتر نابینن، بەلام نەزانو تاکە نەخۆشەکان سەرتاپای خولیاو ئارەزوو کۆششو خەباتیان لە پێناو سامانو خواردنو خواردنەوەیە.

٥- دەکرێت سامانو دارایی مرۆڤەکان نرخیان بۆ دابنرێتو پێوانە بکرێن، بەلام هیچ کات عەقڵی مرۆڤەکان نرخی بۆ دانانرێتو عەقڵ وەك خەلاتێکی خوایی بە گەورەترین بەخششو خاسییەتی مرۆڤ دێتە هەژمارکردن.

# براوەکان سزا دەدرێن!!!

هاوتا ڕەشید/ کەرکوک

پاشایەك هەستیكرد.. ئیدی خەریکە بەرەو بەساڵاچوون دەچێتو لەبەرئەوەش کە کوڕی نییە.. دەبێت بیر لە جێنشینێك بکاتەوە.. تا لە دوارۆژدا فەرمانڕەواییەکەی بەڕێوە ببات. پاشا لەبەرئەوەی تەنها کچێکی هەبوو.. بە گوێرەی دابو نەریتی وڵاتەکەیان لە دوای خۆی زاواکەی دەبوو بە پادشا. هەر لەبەرئەمە دەیویست کەسێکی داناو لێهاتوو بکات بە زاوای خۆی.. تا لە پاش مەرگی، هەم بۆ کچەکەی کەسێکی باش بێت.. هەم بۆ وڵاتیش پاشایەکی داناو دادپەروەر بێت.

بۆ ئەم مەبەستەش، داوای لە وەزیرەکانی کرد کە بۆ سبەی، خەڵکی لە گۆڕەپانێکدا کۆ بکەنەوە. لە کاتی دیاریکراودا خەڵکێکی زۆری وڵات ئامادە بوون.. پاشا بە خەڵکەکەی ڕاگەیاند کە ئەمڕۆ پێشبڕکێیەك هەیە بۆ گەنجەکان.. بە گەنجەکانی گوت: ئەوەی ئارەزووی لە پێشبڕکێ هەیە.. با بێتە ناو گۆڕەپانەوە.

زیاتر لە سەد گەنج ئامادەیی خۆیان بۆ پێشنیازەکەی پادشا نواند، کاتێك گەنجەکان چاوەڕوانی فەرمانی پادشا بوون، پادشا پێی گوتن: پێشبڕکێکە، لە تەواوی پێشبڕکێکانی دیکە جیاوازە.. چونکە لەم پێشبڕکێیەدا، براوەکان سزا دەدرێنو دۆڕاوەکانیش خەڵاتیان پێ دەدرێت.. هەرچی دۆڕاوە، خەڵاتەکەی دە لیرەی زێڕە.. براوەش سزایەکی زۆر سەختی بۆ دانراوە.

خەڵکیو گەنجە بەشداربووەکان، بەم مەرجە بە تەواوەتی سەرسام بوون.

کاتێك پێشبڕکێکە دەستی پێکرد.. تەواوی بەشداربووان، خۆیان دوا دەخستو هەوڵی دۆڕانیان دەدا، جگە لە گەنجێك کە بە پەرۆشەوە بەرەو سەرکەوتن هەنگاوی دەنا!!!

لە کۆتاییدا هەمووان دۆڕانو گەنجەکەش بوو بە براوەی پێشبڕکێکە، هەموو بەشداربووەکان گاڵتەیان پێ دەکردو پێیان دەگوت: چییە؟! دەڵێیت لە گیانی خۆت بێزاریت.. ئایا نازانی ئێستە سزایەك چاوەڕێتە؟

گەنجەکە هیچ وەڵامێکی نەدانەوە.

دواتر پادشا لە ناو گۆڕەپانەکەدا، دە لیرەی بە خەڵات بە خشی بە هەر یەکێك لە دۆڕاوەکان.. پاشان ڕووی لە گەنجە براوەکە کردو گوتی: باشە تۆ لە سزا ناترسیت؟!

گەنجەکە گوتی: نەخێر.. چونکە من تەنها ویستم خۆم تاقی بکەمەوە.

پاشاش ڕووی لە خەڵکەکە کردو گوتی: هەر ئێستەو هەر لێرەدا.. ئەم گەنجە سزا دەدەم. سزاکەشی ئەوەیە: کە (کچەکەی خۆمی لێ مارە دەکەم)!

خەڵکەکەو بەشداربووەکان بە تەواوی سەریان سوڕماو لە وتەکانی پادشا هیچ تێنەگەیشتن.

پاشان پاشا ڕووی لە دۆڕاوەکان کردو گوتی: ئێوە تەنها لەبەر خەڵاتو پاداشت، هەوڵی سەرکەوتن دەدەنو سەرکەوتنیشتان بە خەڵاتو پاداشتەوە دەوێت. ئێوە لەبەر خەڵاتو پاداشت.. دەستبەرداری سەرکەوتنتان بوون، ئێوە هەتا سەرکەوتنتان بە خەڵاتو پاداشتەوە بوێتو لە هەموو سەرکەوتنێکدا چاوەڕوانی خەڵاتو پاداشت بن.. دڵنیابن هەر شکست چاوەڕوانیتان دەکات. ئێوە دەبێت ئەوە فێر ببن کە نابێت هیچ کات لە ترسی سزا، دەستبەرداری سەرکەوتنتان ببن.. چونکە (براوە هەر سەرکەوتووەکانن.. نەك ئەوانەی خەڵاتو پاداشتیان پێ دەبەخشرێت).

# یەکەمینەکان

بەشی یەکەم

ئا: جەلال جەباری

* یەکەم ئێزگە (ڕادیۆ) لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دامەزرا، لە سالی (١٩٠٩ز) دەستی بە پەخش کرد.

* یەکەم (ڕۆژنامە) لە ولاتی ئەلمانیا داهێنرا، لە سالی (١٥٠٣ز) بە ناوی (نیوزتیک).

* یەکەم کۆمپیوتەر لە سالی (١٩٤٤ز) لە زانکۆی (هارڤارد)ی ئەمەریکی لە لایەن زانا (هوارد ئایکن)ەوە دروستکرا.

* یەکەم هۆزێک کە (کاکاو)یان دۆزییەوە (هندییە سوورەکان)بوون لە ئەمەریکا.

* یەکەم کەس کە جلوبەرگی دووریو پیشەی خەیاتی داهێنا پەیامبەر (ئیدریس) بوو (سەلامی خوای لێبێت).

* یەکەم چاپەمەنی لە نیشتیمانی عەرەب لە سالی (١٦١٠) زاینی دامەزرا لە ولاتی لوبنان بە ناوی چاپەمەنی (دیرقزحیا).

* یەکەم کەس کە نەخشەی جیهانی کێشا (شەریف ئیدریسی یەکەم) بوو، لە سالی (٥٤٥)ی کۆچی کە بە تازەترین نوێگەری لەو کاتەدا ناو برا.

* یەکەم کەس کە شاری بەغدادی بنیاتنا (ئەبو جەعفەری مەنسور) بوو، لە سالی (١٣٦)ی کۆچی دا بوو، کە لەو کاتەدا بەغداد بە شاری (ئاشتی) ناسرابوو.

* یەکەم کەس کە بووە سەرۆکی یەکێتی تۆپی پێی جیهانی (فیفا)، (ڕۆبەرت جێرنی) فەرەنسی بوو، لە سالی (١٩٠٦ز).

* یەکەمین کتێبی کوردی لە سالی (١٨٤٤ز) بە ناوی (مەولانا خالید) لە ئەستەمبول چاپکرا.

* یەکەم بۆنەی کرێکارانی جیهان لە سالی (١٨٨ز) بەڕێوەچوو لە ولاتی ئەمەریکا.

* یەکەم وێنەی فۆتۆگرافی لە سالی (١٨٢٦ز) گیرا لە لایەن زانایەکی فەرەنسییەوە بە ناوی (نیبسی) کە ٨ کاتژمێری خایاند.

* یەکەم ئاریالی تەلەفزیۆن لە سالی (١٨٩٥ز) دروستکرا لە ولاتی ڕووسیا لە لایەن زانا (ئەلیکسەندەر بربۆفی)یەوە.

* یەکەم ئامێری تەلەفۆن لە سالی (١٨٧٦ز) دروستکرا لە ولاتی ئەلمانیا لە لایەن زانا (گراهامبێل)ەوە.

* یەکەم مەکینەی دروومان لە سالی (١٨٧٠ز) دروستکرا لە ولاتی ئینگلتەرا لە لایەن زانا (تۆماس سێنت)ەوە.

* یەکەم (تایەی لاستیك) لە سالی (١٨٨٩)ز لە ولاتی (ئێرلەندا) دروستکرا لە لایەن زانا (دان لۆب)ەوە.

* یەکەم (سەماعە) لە سالی (١٩٢٤)ز لە ولاتی (ئەمەریکا) دروستکرا لە لایەن زانا (ڕایس کلۆك)ەوە.

* یەکەم (دینەمۆ) لە سالی (١٨٦٩)ز لە ولاتی (بەلجیکا) دروستکرا لە لایەن زانا (زنۆب گرام)ەوە.

* یەکەم (گەرمیپێو) لە سالی (١٩٥٣)ز لە ولاتی (ئیتالیا) دروستکرا لە لایەن زانا (گالیلۆ)وە.

* یەکەم (مەنجەلی بوخار) لە سالی (١٧٠٥)ز لە ولاتی (بەریتانیا) دروستکرا لە لایەن زانا (نیەگما)ەوە.

* یەکەم (گلۆپ) لە سالی (١٨٧٩)ز لە ولاتی (ئەمەریکا) دروستکرا لە لایەن زانا (ئەدیسۆن)ەوە.

* یەکەم (ڕەشاش) لە سالی (١٨٦١)ز لە ولاتی (ئەمەریکا) دروستکرا لە لایەن زانا (هاتل نیك)ەوە.

* یەکەم (شەمەندەفەر) لە سالی (١٨٠١)ز لە ولاتی (ئەمەریکا) دروستکرا لە لایەن زانا (ترۆتیك)ەوە.

* یەکەم (دەمانچەی چواردە خۆر) لە سالی (١٩١٦)ز لە ولاتی (ئەمەریکا) دروستکرا لە لایەن زانا (لانگسلی)یەوە.

سەرچاوە/ ئینتەرنێت ماڵپەڕەکانی/ (www.aljsad.net, www.flying-way.com, ar.wikipedia.org).

# هەستی بەرپرسیارییەتی

زاهیر زانا

ڕەنگە زۆرجار بیرمان لەهەموو شتەکانی چواردەورمان کردبێتەوەو پێیان سەرسام بووبین، بەلام خەیاڵمان لای ئەو شتە گرنگە نەبووبێت کەناوی هەستی بەرپرسیارێتییەو بەرپرسە لە هەموو ساتەکانی ژیانمانو ڕۆڵێکی گەورەو گرنگ دەگێرێت لەسەر کەسایەتیو ڕەفتارو هەڵسوکەوتو کارو کردەوەکانمانو دەبێت بمانجولێنێتو بمان وەستێنێت تائەرکەکانی سەرشانمان بەجێ بهێنین.

ئایا تائێستا بیرمان لەوە کردووەتەوە کە بەرامبەر بەوەی ژیانمان پێ بەخشراوە ئەرکمان چییە؟ یان بەرامبەر بە ئەندامەکانی جەستەو ماڵو سامانو قەڵەمو منداڵەکانمانو... هتد، بەرپرسیارێتیمان چییە؟ ئایا دەگونجێت کەسێك لە فەرمانگەیەکدا فەرمانبەربێتو تەواوی مافو ئیمتیازاتی هەبێتو داوای هیچ کارێکی لێ نەکرێتو بەرامبەر هیچ شتێکیش بەرپرسیار نەبێت؟ زۆر بێ مانایە ئێمەی مرۆڤ پێمان وابێت لە ژیاندا ئەرکێکمان لەسەرشان نییە! لەو بڕوایەدان هیچ ژیرێك بڕوا بە وەها قسەیەك بکات؟!

ئەدی دەگونجێت لە پێناوی مرۆڤدا خۆرو ئەستێرەو مانگو دەریاو هەواو... هتد، لە جوڵە دابنو مرۆڤیش هیچ کارە بێتو ئەرکێکی لەسەرشان نەبێت، وەك شاعیر دەڵێت:

ئەم کەونە گەورە بێ وەستا نییە
لەوەڕگایەکی بەڕەڵڵا نییە
نەئێمە ئاژەڵ نەئەو پاوانە
مەستیو خامۆشی تیا ڕەوا نییە.

هەستی بەرپرسیارێتییە کە ڕەوڕەوەی ژیان لە وەستان ڕزگار دەکاتو دایك منداڵ بەخێو دەکاتو هەموومان بە یاساو ڕێساکانەوە پەیوەست دەکات، مرۆڤ بەرپرسیارە بەرامبەر هەلگرتنو هەڵنەگرتنی هەر هەنگاوێکو ئەرکی پیشەییو کۆمەڵایەتی لەسەرەو خۆی بەرپرسیارە بەرامبەر سەرکەوتنو نوشوستەکانی، بەرامبەر هەموو هەنگاوەکانی ژیانی، وەك لە گریمانەکانی (nlp) دا هاتووە (أنا اتحكم فی عقلی وأنا مسئول عن نتائج أفعاله)، جێی خۆیەتی پێش کردنی هەر کارێك لە خۆمان بپرسین بۆ ئەم کارە دەکەین؟ یان بۆ ئەم کارە ناکەین؟ لەبەرئەوەی بڕیار لە دەستی خۆماندایەو بەرپرسیاریشین بەرامبەر چۆنییەتی ئاراستەکردنی ژیانمان، دەبێت کاتێك کارێك دەکەین ئەنجامەکەشیمان قبوڵ بێتو بە بەرپرسیارێتییەوە بەرامبەر شکستەکانیش بووەستین، ئەوەتا سارتەر دەڵێت: (ئەو کەسەی هەر بە زگماك شەپڵەدارە، خەتای خۆیەتی ئەگەر لە ئایندەدا نەبێتە پاڵەوانی گۆڕەپانو مەیدان).

بۆیە هەر سستی نواندنێك خەلەلی گەورە گەورە دروست دەکات، ئەوە ژیانە، ئەوە تەمەنە، ئەگەر بە کاری نەهێنین بە فیرۆ دەچێت! هەستی بەرپرسیارێتی پێمان دەڵێت: نەوەستینو بجولێین، دانابینو دەبەنگ نەبین، پاڵمان پێوەدەنێت کاربکەینو کەمتەرخەم نەبین، هانمان دەدا، ناچارو ملکەچمان دەکات، کەواتە با هەستی بەرپرسیارێتیمان زیاتربکەینو نرخی ئەو بەخششە گەورەیە بزانین کە ناوی هەستی بەرپرسیارێتییە، کاتی ئەوە هاتووە هەستی بەرپرسیارێتی بەرامبەر ژیانو بوون کۆنترۆڵی سەراپای هەنگاوەکانمان بکات، تا ئەرکەکانمان بە باشترین شێوە جێبەجێبکەینو ئامانجەکانمان بپێکینو سەرکەوتنو بەختەوەری بەدەستبهێنین، ژیان پێویستی بە ئێمەیەو ئێمەش پێویستە نەوەستینو بڵێین:

خەبات بۆ ژیان تاکە ڕێی ژینە
تەنها تێکۆشان خۆشو شیرینە
تەممەڵیو سستی کاری نەزانە
کەسی بەرپرسیار پڕ گڕو تینە

من و تۆی مرۆڤ بەرپرسیارین بەرامبەر جوانترکردنی ژیانو ئاوەدانکردنەوەی زەوی، هەر پشتگوێخستنێكو هەر خۆ لە بەرپرسیارێتی لادانێکیش دەبێتە هۆی دروستبوونی کەلێنێکو مێژووش بەرپرسیارمان دەکات، کورد وتەنی: (کاڵەك بە ئەژنۆ شکاندن دادمان نادات).

ئەوەتا کاتێك ئەرکەکانی سەر شانمان بە باشی جێبەجێ دەکەین، هەست بە ئارامییەکی قوڵی دەروونی دەکەینو گڵۆپی سەوزی ویژدانمان دادەگیرسێتو پاداشتی بەختەوەریمان دەکات، کەواتە بەرپرسیاربە، بە دڵنیاییەوە لە هەست بە بەرپرسیارێتیکردندا زەرەرو زیانو پەشیمانی نییە، بەڵام لە کەمتەرخەمیدا پەنجەی پەشیمانی گەستنو سەرگەردانی هەیە.

# لە نزیکترین دەرگاوە بچۆرە نێو دڵەکانەوەو

# بۆ هەمیشە تیایاندا نیشتەجێ بە

گوڵان حەمە ئەمین

گەرهەستو سۆزو ئەوینو ئەندێشە لە مرۆڤەکان جودا بکەینەوە، ئەوا تەنها ئامێرێك، یا ڕۆبۆتێك دەمێنێتەوە، بەڵام ڕۆبۆتێك کە بزوێنەرەکەی ڕۆحە، کاتێك دەتوانین سودمەند بین لە هەستو سۆزو ئەوین کە بتوانین لە ناخمانەوە بیگوێزینەوە بۆ وتەو کردەوەکانمان، ئەو کات توانیومانە وەك مرۆڤێکی هاوسەنگ مامەڵە بکەین، لە ڕاستیدا ئاشتیو پێکەوە ژیانو خۆشەویستیو ئارامی دەروونیو خێزانیو کۆمەڵایەتیش بەم بنەمایەوە پەیوەستە، بە نەمانیشی لێکترازانو نائارامیو نیگەرانیو لە دەستدانی هاوسەنگیو ڕۆیشتن بەرەو کەناری گۆشەگیریو تەنهاییو بێ متمانەییو زۆرجار خۆکوشتنو خەڵك کوشتنیشی بەدواوە دەبێت!

بۆ زیاتر تێگەیشتن ئێستا باپێکەوە بیر لە ڕۆژێك لە ڕۆژە کانی ژیانمان بکەینەوە، ئێستا بیربکەرەوە لە یەکێك لەو ڕۆژانەی ژیانت کە زۆر ماندووبوویت هەستت بە نیگەرانیو بێزارییەکی تەواو دەکرد، ڕۆشناییەکت لە ژیانتدا بە دی نەدەکرد وەك لە نێو کوردەواری دا باوە دەڵێن: (وەك پاپۆڕەکەت نقوم بووبێت) هێندە دەروونت ماندوو داخراو بوو کە کاری کردبووە سەر جەستەت، هێزی کەم کردبوویتەوەو نانت بۆ نەدەخوراو خەوت لێ نەدەکەوت، لە ئەنجامی کێشەیەك کە خۆت بە دەستەوسان دەزانی لە ئاستیدا، بێگومان هەمووان لەو ڕۆژە سەختانە هەنگاومان ناوە، بەڵام لەم ساتە داخراوو بێزراوەدا هاوڕێیەکت ئەندامێکی خێزانەکەت، یاخود کەسێکی نەناسراو، بە ڕوویەکی گەشاوەوە وەك مانگی چواردە، بە لێوێکی پڕ لە خەندەو بە زوبانێکی شیرینی وەك هەنگوین، بیری هێنایتەوە کە تۆ کێیت؟

کە تۆ کەسێکی سەرکەوتوویت، هەڵگری پەیامی ئاشتیو بەختەوەریت، هەرگیز ناڕوخێیت، بەم وتانە چیا بەستووەکەی خەمی دڵی تۆ دەستی کرد بە توانەوە، خەندە کەوتە سەرلێوەکانت، وزەیەك هاتەوە بە گیانتدا، هەستە نێگەتیڤەکەت گۆڕا بۆ هەستێکی پۆزەتیڤ، وات زانی ئەوە فریشتەیەك بوو هات پەیامێکی بەختەوەری بۆ هێنایت، دەزانی ئەو دەرمانە ئەفسوناوییە چی بوو؟ ئەو چارەسەرە سحرییە چی بوو؟ کە تۆی ڕزگار کردو لە کەناری بێئومێدییەوە گەڕاندیتییەوە بۆ ڕۆخی خۆشیو خەندەو ئومێد! ئەوە زمانی شیرینو وشەی جوانو دڵسۆزی بوو، بێ ماندووبوون زۆر بە سادەیی تەنها دڵسۆزی دەوێت، زۆرجاریش هەر بەو زوبانە وشەیەکت ئاڕاستە دەکرێت کە لە لوتکەی ئومێدو خەندەو خۆشیو ئاسودەییەوە نوقمی دەریای بێزاریت دەکات، ئەوەش هەر وشەیە، بەڵام وشەیەکی ناپەسەندی ڕووخێنەر، کەسانێك هەن لە کۆمەڵگەدا پیشەیان تێکشکاندنی وزەو خۆشی دەوروبەریانە.

خوێنەری ئازیز با بپرسین ئایا ئێمە لەو کەسانە نین کە بە هۆی وتەکانمانەوە خۆشەویستیمان لە دڵی بەرامبەردا تێکشکابێت؟ دەگونجێت زۆرجار ئەو کەسەی کە ڕاهاتووە لەسەر ئەوەی کە خاوەنی زمانێکی ئاسنین بێت هەست بەوە نەکات کە وشەکانی دەبێتە تیرێكو دەیدات لە لوتکەی خەندەو خۆشی بەرامبەرەکەی، کەوابێت بۆ وشەکانمان نەگۆڕین بە هەڵنان بە وەسفی گونجاو، بە وشەی پۆزەتیڤ... ڕەنگە بە ناردنی کورتە نامەیەك بۆ هاوڕێیەکمان بە سڵاوێکی بێ خەوش، هەواڵپرسینێکی دۆستانە، خەم هەڵگرێکی ڕاستگۆیانە ببێتە هۆی بوژانەوەی کەسێك، ڕزگارکردنی کەسێك لە زیندانی خەمو خەفەت، بارەزیل نەبین لە بەخشینی ئەو دیارییە مەعنەوییە، ئەو

کەسە هەر کەس بێت، خوێندکارێکت، یان کرپارێکت بێت، فەرمانبەرو هاوڕێییەکت بێت... یا ئەندامێکی خێزانەکەت بێت، ئەو هەڵوێستە جوانو مەردانەیەت، ئەو وتە بنیات نەرو هەڵنانە لە دڵی بەرامبەردا تۆمار دەبێتو یادی تۆ بۆ هەمیشە بە زیندویەتی لە لاپەڕەکانی دڵیدا دەمێنێتەوە، با بزوێنەری ئومێدو خەندەو خۆشی بین لە هەر کوێ بووین پەیامی ئاشتی پەخش کەین، ئەوە ڕاستییەکەو هەر زوو وتراوە: (چی بچێنیت، ئەوە دەدووریتەوە)، بەڕاستی ئەوەی دەیبینینو بەرامبەرمان دەکرێت ئاوێنەی ڕەوشتی خۆمانە، هەڵوێستەکانمان پەرچەکردارەکانمانە، هیچ مرۆڤێك نییە کە خاوەنی شتانێك نەبێت کە لانی کەم جێی دڵخۆشی خۆی بێت تەنانەت ئەگەر لە ڕووخسارو جوانیشدا بێت کەوابێت بۆ بە سیفەتە جوانەکانمان ناوی یەکتر نەهێنین لە کاتێکدا یەکتر دەدوێنین، جا ئەو کەسە منداڵێك بێت، لاوێك بێت، سەرۆکی وڵاتێك بێت، وتەی قەشەنگو جوان کاری لێ دەکاتو دڵی هۆگری عیشقو خۆشەویستیت دەبێت، بەوەش بە ئاسانترین ڕێگا دەچیتە دڵی بەرامبەرەوەو بۆ هەمیشە نیشتەجێ دەبیت تێیدا!

با چیدی پردی پەیوەندیمان بە زوبانێکی ئاسنین نەڕوخێنین، لەوەش دڵنیابە هەرکات پەیامێکی نێگەتیفت لە ناختەوە نارد بۆ کەسێك، گەر بە ڕاستەوخۆش نەبێت تەنانەت لە ناخیشتدا بێت یەکەم کەس خۆتی کە هەست بە ئازار دەکەیت، ئەی نابینیت کاتێك ئاگرێگ بەربدەی لە هەرشتێك ئەو ڕێگایەی ئاگرەکەی پێدا تێدەپەڕێت دەسوتێتو شوێنەواری ئاگرەکەی لەسەر جێ دەمێنێت، ئەو ئاوەی دەڕژێتە دەریاوە ڕێگاکەی کە پێیدا تێپەڕ دەبێت تا بە ئاوەکە تەڕ نەبێت ئاوی پێدا دەڕوات؟ کەواتە ئێمەش وشە جوانەکان لە سەرەتاوە خۆمان دڵخۆش دەکات، وشە ناپەسەندەکانیش یەکەمجار خۆمان تووشی ئازار دەکات، با هەوڵ بدەین خۆمان بە خەمخۆری هەمووان بزانینو هەڵگری ڕازو ڕەوێنەرەوەی خەمەکانیان بین، چونکە یەکەمجار خۆمان لە بەرهەمەکەی سودمەند دەبین، لە داهاتووشدا دەبینە خاوەنی کۆمەڵگایەکی پڕ هەستو سۆزو ئەوین کە هەمووان بە ئەندامی خێزانی ماڵێك هاوکاری یەکتر بین، ئەگەر چی دەوروبەریش وانەبوون، وتراوە وەك درەخت بە، کاتێك بەردی تێ دەگرن، ئەو بەرهەمی جوانیان تێ دەگرێت!

# وێنەیەکی سەیر

**و: تاڤگە هاشم محەممەد**

پاشایەك هەبوو، شەل بوو، چاوێکیشی کوێر بوو، ڕۆژێکیان ئەم پاشایە بانگهێشتی هەموو وێنەکێشەکانی وڵاتی کردو لە کۆشکی پاشایەتیدا کۆبوونەوەیەکی لەگەڵدا سازدان، لە کۆبوونەوەکەدا داوای لە هەموویان کرد هەر یەکەو وێنەیەکی پاشا بکێشێت بە مەرجێك عەیبو کەموکوڕییەکانی دەرنەکەوێت لە وێنەکەدا.

لێرەدا هەموو وێنەکێشەکان ئەم داواکارییەی پاشایان ڕەتکردەوە، چۆن بتوانن وێنەی پاشا بکێشن بە دوو چاوەوە، لە کاتێکدا پاشا یەك چاوی هەیە؟! ئەی چۆن بتوانن وێنەی هەردوو قاچەکانی بکێشن لە کاتێکدا قاچێکی لەوەی تریان کورتترە؟!

لەم کاتەدا هەموویان سەرقاڵی ئەم مشتومڕە بوون، یەکێك لە وێنەکێشەکان وتی: من وێنەکە دەکێشم!!

بەڵی هەستا بە وێنەکێشانی پاشا، بەڵام بەڕاستی وێنەیەکی جوانو نایاب دەرچوو، هەموو ئامادەبووان سەرسام بوون، چۆن؟

وێنەی پاشای کێشا، کاتێك پاشا ڕاوەستاوەو تفەنگەکەی بە دەستەوەیە لە کاتی ڕاوکردندایە، دەزانن چۆن؟ وێنەکەی وەها کێشا کە پادشا خەریکە نیشان دەگرێت لە ئاسکێكو قاچە شەلەکەی چەمانۆتەوەو چاوە کوێرەکەی نوقاندووە!

دەبا ئێمەش بتوانین وێنەیەکی جوانی بەرامبەرەکەمان بکێشین، هەرچەند عەیبو نارێکیەکانیان لەبەرچاو بێتو دیار بێت.

هەرکاتێك ئێمە توانیمان ئەم وێنەیە بە جوانی نیشان بدەین، ئەوا دەبینە هۆی داپۆشینی شتە ناشیرینو نارێکەکان، چونکە پێویستە بزانین هیچ کەس بێ کەمو کورتی نابێت، با هەردەم سەیری نیوە پڕەکەی پەرداخ بکەین، نەك نیوە بەتاڵەکەی.

سەرچاوە / ئینتەرنێت.

# چاوپێکەوتنێك لەگەڵ
# نەریمان ئەنوەر
## داهێنەری یەکەمین فڕۆکەی کوردی

ئا: هەڵگورد مەسعود شاکر

**لە خەونە دوورەکان مەترسن**

دەبێت نەوەکانی ئەم لاوە لە داهاتوودا چەند دڵخۆش بن، ئەو کاتەی لە قوتابخانە بەوپەڕی شانازییەوە لە لای هاورێییەکانیان باسی ئەوەیان بۆ دەکەن، کە چۆن باوکیان وەك یەکەمین گەنجی کورد توانیویەتی فڕۆکە دروست بکات، لە وڵاتێکدا کە داهێنانی لەم جۆرە نەك لە هەستی تاکەکانی نەتەوەکەیدا مەحاڵ بووە، بەڵکو حکومەتەکەشی هەمان بۆچوونی هەبووە، ئەو گەنجە((نەریمان ئەنوەر صالح))ە و لە دایکبووی شاری هەولێرەو خاوەنی بڕوانامەی (سێ)ی ناوەندییە، کە دروستکردنی فڕۆکەو بواری فڕۆکەوانی یەکێك بووە لە خەونە گەورەکانی منداڵی، دواجار توانی لە بەهاری ئەمساڵدا خەونەکەی بکات بە ڕاستی، ئەویش بە دەستەکانی خۆی یەکەمین فڕۆکەی کوردی هەڵفڕاندە ئاسمانی کوردستان، بۆیە گۆڤاری بڕیار، بڕیاری دا، ئەمجارە لە ڕێگای دیمانەیەکی تایبەت ئەم داهێنەرە بدوێنێت، کە زۆربەمان بە کورتی هەواڵی سەرکەوتنی ئەم داهێنەرەمان بیستووە کە چۆن توانی فڕۆکە دروست بکات، بەڵام نەك بەو شێوەی ئێستا لە بڕیاردا دەیخوێنینەوە.

**بڕیار/ سەرەتای بیرۆکەی دروستکردنی فڕۆکە لە مێشکی تۆدا چۆن سەری هەڵدا؟ ئایا ئەم بیرۆکەیە بە قۆناغی خەونو ئامانج، دواتر جێبەجێکردن تێپەڕیووە؟**

نەریمان ئەنوەر: بێگومان، ئێمە زۆرجار لە فیلمە سینەماییەکان دەبینین منداڵێك خەونی هەیە، ئەو خەونە دواتر دەبێتە ڕاستی ئەگەرچی ئەوە فیلمە، بەڵام حەقیقەتێکیشی هەیە، واتە هەمووی خەیاڵ نییە، بوونی خەون هۆکارێکە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان، بۆیە منیش دروستکردنی فڕۆکە خەونی منداڵیم بوو، بە بەڵگەی ئەوەی لە ساڵی ١٩٩١ەوە خەریکی دروستکردنی فڕۆکە بووم، کە سەرەتا تەنها فڕۆکەی بچووکم دروست دەکرد، دواتر بەردەوام لەو بوارە شتم دەخوێندەوەو سەفەری وڵاتانم کردووەو بەشداری چەندین خولم کردووە لە ئەنجامدا توانیم بگەم بە خەونەکەم،

**دانابوو، لە هاتنەدی ئەو خەونە؟**

**نەریمان ئەنوەر:** پێش هەموو شتێك یەكێك لە ڕێگرەكان گەمارۆی سەر عێراق بوو، چونكە بە پێی بەندی (٧) هەر كەلوپەلێك پەیوەندی بە بواری فڕۆكەوانییەوە هەبێت نابێت بێتە ناو خاكی عێراقەوە، لەبەرئەوە مەكینەی فڕۆكەكەم كە لە دەرەوە هێنام، بە مەكینەی ئۆتۆمبێل نووسیم، بۆیە بێگومان من دەمزانی هاتنەدی ئەو خەونە هەروا ئاسان نییە، لێرەدا من دەمەوێت باس لە خودی متمانە بكەم بۆ ئەو گەنجانەی كە بیرۆكەی داهێنانی گەورەیان هەیە، كە چۆن ڕووبەڕووی ئەو گرفتانە دەبنەوە، چەند ئامادەن قوربانی ببەخشن لە پێناو خەون و ئامانجەكانیان، من نەك لە لایەنی ماددی بگرە لە ڕووی جەستەیی و لایەنی كۆمەڵایەتیش قوربانی زۆر گەورەمدا، بۆ نموونە تا ماوەیەكی زۆر دابڕام لە خزم و كەسەكانم و كاری تایبەتی خۆم، بەڵام ئەو كەسەی كە بەهرەی (خوای) گەورەی تێدایە هیچ شتێك ساردی ناكاتەوە، كاتێك باسی خەونەكەم دەكرد بۆ هەندێك كەس دەیانگوت نەریمان شێت بووە! چونكە ئەوەی ئەو داوای دەكات زۆر گەورەیە، بەڵام كەسی سەركەوتوو نابێت قسەی خەڵك كاریگەری لەسەر هەبێت، چونكە ئەوەی گەیشتووەتە خەونەكانی، هیچ شتێكی لە من زیاتر نییە، شتێك هەیە كە وەك یاسایە بۆ ئەو كەسانەی دەیانەوێت داهێنان بكەن، هەموو داهێنەرێك سەرەتا قوربانی داوە و چەندین جار شكستی هێناوە، بەڵكو هەندێك كەسی داهێنەر هەن تا دەشمرێت سوود لە داهێنانەكەی وەرناگرێت، خۆ من هەر لە منداڵییەوە دەستی داهێنانم هەبوو، پاشان كەسە نزیكەكانم پێیان وابوو ناگەم بە هیچ ئەنجامێك، ئەمە جیا لەوەی لە زۆربەی فەرمانگەكانی حكومەت كاتێك دەچووم بۆ لایان متمانەیان پێ نەدەكرم كە من دەمەوێت فڕۆكە دروست بكەم، تەنانەت چەندین بەرپرسی گەورەی ئەم وڵاتەش، بەڵام خۆم زۆر بە باشی ئەو ڕووناكییەم دەبینی كە ڕۆژێك لە ڕۆژان دەگەم بە ئامانجەكەم و لە ئاسمانی كوردستان دەفڕم، چونكە هەموو ئەو كەسانەی خەون و ئامانجیان هەیە ئەو ڕووناكییە دەبینن، هەر ئەوەش بوو نەوەستام تا فڕۆكەكەم تەواوكرد، من هەموو ڕۆژێك ئەوەم دەهێنایە بەرچاوی خۆم كە ڕۆژێك دێت من بە فڕۆكەكەی خۆم بە ئاسمانی كوردستاندا دەفڕم، هۆكاری ئەمەش بە

بەڵام چۆن؟ من هەمیشە دەڵێم: «هەرگیز لە خەونە دوورەكان مەترسن» چونكە هەر بەدەستی دەهێنیت، دەبینیت فڕۆكە لە مێژە دورستكراوە، بۆ یەكەمجار لە مێژوودا لە ساڵی (١٨٧٣) لە لایەن (جۆرج كیلی) لە فەرەنسادا دروستكرا، بەڵام تا ئێستا فڕۆكە لە وڵاتی ئێمەدا دروست نەكراوە، با هەر دەزگایەكی گەورەی وەك (ناسا)ی ئەمریكی ساڵانە دەیان مووشەك دروست بكات و بچێتە سەر مانگ، خۆ ئێمە بە كاریان ناهێنین، یاخود دەستمان لەدروستكردنیاندا نییە، ئیدی چ مانایەكی هەیە!

**بریار/ ئایا تۆ پێشبینی گرفتی گەورەو هاتنە پێشی كێشەو ڕێگری زۆرت بۆ خۆت**

دڵنیاییەوە ئاكامی پشت بەستنم بوو بە خودای گەورە.

**بریار/ لە ساڵی چەند بە تەواوی خەونەكەت خستە بواری جێبەجێكردن؟**

**نەریمان ئەنوەر:** من لە ساڵی (٢٠٠٦) یەكەم هەنگاوی دروستكردنی فڕۆكەكەم بە كرداری دەست پێكرد، دواتر سەفەرم كرد بۆ وڵاتی صین، لەوێ سەردانی یەكێك لە كۆمپانیا گەورەكانی فڕۆكەوانیم كرد، كە بۆ خولی دروستكردنی فڕۆكەو كۆكردنەوەی زانیاری لەو بوارە بە ناوی (Zi) كە لقێكی لەو وڵاتە هەیە، زیاتر لە (٢٠٠) پەرتووكی تایبەت بەو بوارەم خوێندووەتەوە، پاشان گەڕامەوە بۆ كوردستان و دەستم بە كاركردن كرد، كۆمەڵێك كەسی دڵسۆز زۆر هاوكاریان كردم یەكێك لەوانە (محەممەد قادر) كە ١٧ ساڵە لەگەڵ من سەرقاڵی ئەوەیە چۆن بتوانین خەونی دروستكردنی فڕۆكەی كوردی بكەینە ڕاستی، (مقداد تەها و ئەمجەد سەید گوڵ بەرزنجی و مەسعود محەممەد و كاك سەعید بارزانی و كاك ڕزگار) هەروەها كوڕەك تیلیكۆم و هەر یەك لە وەزیران (د.ئیدریس هادی و تەها بەرواری)، دواتریش پارێزگاری هەولێر (نەوزاد هادی)، ئەویش بەڕاستی زۆر هاوكاری كردووم، جگە لەوەش شتێكی دیكە هەیە، دوای ئەوەی هەواڵی دروستكردنی فڕۆكەكەم بڵاوكرایەوە لە تەلەفزیۆنەكان لە مانگی (٣)وە تا ئەمڕۆ (٢٦٤٠) كەس پەیوەندیان پێوە كردووم كە ئەوانیش حەز بە بواری فڕۆكەوانی دەكەن و دەیانەوێت من یارمەتیان بدەم، ئەو كەسانەش لە دەرەوەو ناوەوەی هەرێمی كوردستانن، دەمەوێت ئەوەشتان پێ بڵێم من جگە لەو فڕۆكەیەم (٤) فڕۆكەی ترم دروستكردووە، بەڵام لە هەر یەكیان كێشەیەكم هەبووە، سوپاس بۆ (خوا) لە فڕۆكەی پێنجەم توانیم سەركەوتن بە دەست بهێنم، ئەم فڕۆكەیەش چەند تایبەتمەندییەكی هەیە، خێراییەكەی لە كاتژمێرێكدا (١٨٠ تا ٢٠٠) كیلۆمەتر دەڕوات، (١٢٠٠٠) هەزار پێ لە زەوی بەرز دەبێتەوە، (٢) نەفەر هەڵدەگرێت، دەتوانێت بۆ ماوەی (٤) كاتژمێر لە ئاسمان بمێنێتەوە، لە سنوورێكی كەمدا هەڵدەستێت و دەنیشێتەوە، ناوەكەشی ئەمریكییە پێی دەڵێن: ستۆك (٧٠١)، دیزاینی فڕۆكەكە زۆر گونجاوە لەگەڵ ئاووهەوای كوردستان، ئەم جۆرە فڕۆكەیە لە جیهاندا دەبێت فڕۆكەخانەی تایبەتی خۆی هەبێت، بەڵام ئەوەی من دەتوانێت لە هەموو شوێنێك بنیشێتەوە، هەر خۆم توانیم

یەکەمین جار فڕۆکەکەم هەڵبفڕێنم، ئەمەش هێزو بڕوابەخۆبوونێکی گەورەی دەوێت. من ڕۆحی خۆم لە ناو دەستمدا دانابوو لەگەڵ هاوڕێیەکەم، چونکە ئێمە ئەو ڕۆژەی فڕۆکەکەمان بە ئاسماندا هەڵفڕاند بە ماڵەوەمان نەگوتبوو، لەبەرئەوە بەیانییەکەی هەموو ئەندامانی ماڵەوەم ماچکردو پاشان ڕۆیشتم، چونکە نەماندەزانی ئایا بە سەلامەتی دەنیشینەوە، یاخود لە ئاسمان فڕۆکەکەمان تێك دەشکێت.

بڕیار/ ئایا پێتوایە ئەرکی تۆ وەك تاکێکی ئەم وڵاتە بە دروستکردنی یەك فڕۆکە تەواو بووە؟

نەریمان ئەنوەر: وەك پێشتر باسمکرد، سەرەتا فڕۆکە لای من تەنها حەزوخەونێك بوو، بەڵام ئێستا حاڵەتەکە گۆڕا، چونکە من تەنها کلیلی دەرگاکەم بە دەستهێناوە، کەواتە دەبێت بڕۆمە ژوورەوەش بۆ ئەوەی بزانم چی تێدایەو چیم پێ دەکرێت، پرۆژەکانی منیش بە درێژایی ژیانمو بەردەوام دوایی نایەت، بۆیە ناوەستم تا گەورەترین کۆمپانیای دروستکردنی فڕۆکەوانیو تا ئەو ساتەش کە پەیمانگایەکی فڕۆکەوانی دادەمەزرێنم، گەر نەشمتوانی هەموو ئەو کارانە بکەم هیوام وایە هەر هیچ نەبێت لە بواری فڕۆکەسازیدا بخەمە سەر پێی خۆی بۆ کەسانی دوای خۆم، چونکە من نامەوێت تەنها باسی نەریمان بکرێت، بەڵکو دەبێت کەسانی تریش لەگەڵ خۆمدا دروست بکەمو ئەوانیش خەونەکانیان بە دەست بهێنن، بۆیە لە تازەترین پرۆژەمدا خەریکی دروستکردنی فڕۆکەیەکی ترم، کە ئەویش فڕۆکەی (٤) نەفەرییە، لە کاتژمێرێکدا (٣٢٠) کیلۆمەتر دەڕوات، (١٣٠٠٠) هەزار پێ لە زەوی بەرز دەبێتەوەو (٤) کاتژمێریش لە ئاسمان دەمێنێتەوە، دوای ئەوەی بە فەرمانی سەرۆکی هەرێم فڕۆکەخانەی هەریر تەسلیم بە من کرا، ئێستا کارەکانی فڕۆکەی دووەمیش هەر لەوێ بە ئەنجام دەگەیەنین.

بڕیار/ سەرکەوتن لای نەریمان چ مانایەکی هەیە؟

نەریمان ئەنوەر: کەسانێك هەن پێیانوایە گەر ناوبانگیان پەیداکرد جا بە هەر شێوەیەك بێت ئەوا وا هەست دەکەن گەیشتوون بە پلەی سەرکەوتن، لە کاتێکدا هەمووومان دەزانین بەشێك لەوانەی ناوبانگیان هەیە ناخۆشترین ژیانیان هەیە، یان هەیە دەیەوێت تەنها پارەیەکی زۆر کۆبکاتەوە کە ئەمەش ڕەنگە لای ئەو کەسانە جۆرێکی تر بێت لە سەرکەوتن، بەڵام هیچ شتێك لەوانە لای من مانای سەرکەوتن نابەخشن، بەڵکو سەرکەوتن لای من ئەوەیە کە چۆن بتوانم بە داهێنانێکی گەورەو نایاب، وڵاتەکەی خۆم بناسێنم بە دونیا، کە ئەمە دواتر خۆی دەبێتە پلیکانەیەك بۆ بە دەستهێنانی سەرکەوتنی تر، چونکە زۆرجار دەڵێن عێراقو کوردستان دواکەوتوون، بۆیە گەر تۆ بەو شێوەیە ناوت ڕۆیشت کەس ئامادە نییە هاوکاریت بکات، یان گوێت لێ بگرێت، من پێموایە تا سنوورێك گەیشتوومەتە سەرکەوتن، چونکە یەکەم کەسم لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەو شێوەیە فڕۆکە دروست بکەم، کە پێشتر نە لە عەرەب نە لە نەتەوەکانی دی شتی وا نەکرایە، هەر بۆیە زۆربەی ڕۆژنامە عەرەبییەکان ناوی منیان ناوە «عەباسی کوڕی فرناسی کوردی) بە هەمان شێوە لە چاوپێکەوتنەکانم لەگەڵ تەلەفزیۆنەکانی «جزیرەو بی بی سیو فۆکس نویزو ئێم بی سیو المصریە».

بڕیار/ گەر توانیت کۆمپانیایەکی دروستکردنی فڕۆکە دابمەزرێنیت، ئەو کەسەی لای خۆت کاری پێدەکەیت، پێویستە چ مەرجێکی تێدابێت؟

نەریمان ئەنوەر: تا ئێستا دووجار سەرۆکی هەرێمی کوردستان بانگهێشتی کردووم، لە یەکێك لە سەردانەکانمدا پرسیاری ئەوەی لێکردم کە ئێمە چۆن پێشدەکەوین بە تایبەتی لە بواری فڕۆکەسازیدا؟ لە وەڵامدا گوتم: پێش هەموو شتێك ئێمە پێویستمان بە دەستگرتنو هاندانی تاکی کوردی بەهرەمەند هەیە، چونکە ئێمە گەنجمان هەیە توانای عەقڵی گەورەی هەیە، بەڵام لایەنە ماددیو مەعنەوییەکەی لاوازە، بۆیە داوام لێکرد سەنتەری بەهرەمەندان دروست بکرێتو لە هەموو شارەکانی کوردستانیشدا لق بکرێتەوە، گوتم کورد لە ڕابردوو شۆڕشی بە چەك کرد، بەڵام ئێستا دەبێت ئەو شۆڕشە بە داهێنانو زانست بێت، دیارە ئەویش زۆر بە خۆشحاڵییەوە ڕەزامەندی دەربڕی، بڕیاری دامەزراندنی پەیمانگایەکی فڕۆکەوانیشی داوە بۆ ڕاهێنانو فێربوون، ئەمە وەك مژدەیەك بۆ هەموو ئەو کەسانەی خەونی داهێنانیان هەیە، سەبارەت بە وەڵامی پرسیارەکەتان دەبێت ئەو کەسە ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١- ماندوونەناس بێت. ٢- بە هیچ شێوەیەك نابێت ڕەخنەو قسەی خەڵك چۆکی پێ دابدات.

٣- گەشبین بێت لە ژیان بۆ خەونو ئامانجەکانی.

٤- لە ڕووی جەستەییەوە توانایەکی زۆری هەبێت. پێموایە بەم مەرجانە کەسێکی بەهرەمەندم دەستدەکەوێت.

بڕیار/ تا ئێستا هیچ ڕێزلێنانێکت بۆ سازکراوە لە بەرامبەر ئەو داهێنانەی کردووتە؟

نەریمان ئەنوەر: لە فستیڤاڵی ساڵانەی وەزارەتی ڕۆشنبیریو لاوان خەڵاتی «لاوی داهێنەر»ی ساڵی (٢٠٠٧)م پێ بەخشرا، هەر لە ساڵی ٢٠٠٧ وەزیری خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی بانگهێشتی کردم بۆ بەستنی سمینارێك لە کۆلێژی ئەندازیاری کە دواتر لەوێ بۆ ماوەی ساڵێك وەك مامۆستای وانەبێژی دەرەکی وانەی کرداریم دەگوتەوە، هەروەها بڕوانامەی شەرەفم پێدرا لە لایەن هێزی ئاسمانی عێراقی بە بۆنەی دروستکردنی یەکەم فڕۆکە لە عێراق، ساڵی ٢٠١٠، گەورەترین بڕوانامەش لای من بانگکردنی سەرۆکی هەرێمی کوردستانە، کە لەگەڵ تیمەکەم چووینە لای بەبێ ئەوەی ئێمە داوای بکەین، بەڵکو خۆی بانگهێشتی کردین.

بڕیار/ لە دوایین پرسیاردا پەیامی تۆ چییە بۆ ئەو کەسانەی وەك تۆ بیرۆکەی داهێنانی گەورەیان هەیە، بەڵام لە ئەرزی واقیعدا جێبەجێی ناکەن؟

نەریمان ئەنوەر: من دەمەوێت شتێك بڵێم بۆ هەموو تەمەنەکان، داهێنانو دروستکردنی شتی باش لە ژیان کە سوودی بۆ مرۆڤایەتی هەبێت باشترینو جوانترین کارە لە ژیاندا، داهێنانیش سنوورێکی زۆر فراوانی هەیەو هەموو کەس دەتوانێت خۆشبەختو سەرکەوتوو بێت لە ژیاندا بە داهێنانەکانی، کەواتە پێش ئەوەی خەونو ئامانجەکانمان ببنە بڵقی سەرئاو با بیخەینە بواری جێبەجێکردنەوە، بەبێ ئەوەی گوێ بە ناخۆشیو گرفتەکان بدەین، دونیای داهێنان زۆر جیاوازە لەگەڵ بوارەکانی دیکەدا، ئەگەر سەیرێکی ژیانی هونەرمەندەکان، یان یاریزانان بکەیت، دەبینیت هەموو ئەم بوارانە وەرزێکە لە تەمەنیانو کۆتایی دێت، بەڵام تا ژیان مابێت ناتوانیت لە داهێنان بووەستیت، ئەگەر خۆت بتەوێت، کەواتە لێرەدا تەمەن هیچ گرنگییەکی نییە، هەربۆیە لە هەموو بوارەکاندا خانەنیشنی هەیە تەنها لە بواری داهێناندا نەبێت، لە کۆتاییدا دیسان ڕووی ئەو قسەیەم لەو کەسانە دەکەمەوە کە خەونو ئاواتیان هەیە، یان دەیانەوێت داهێنان بکەن «تکایە هەرگیز لە خەونە دوورەکان مەترسن».

# ئەو دایکەی دنیای ڕووناك کردەوە!

ئا: ئەسکەندەر ڕەحیم

منداڵێك بە خەمێکی زۆرەوە، بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە، بە هەنسکە هەنسكو قوڵپە قوڵپی گریانەوە کە دڵی بەردینی دەتواندەوە.. بۆ لای دایکی لە دڵا شیرینی گەڕایەوە.

هەر کە دایکی، بە خەفەتو تێکشکاوییەوە منداڵەکەی بینی.. بەر لە سنگی، بە دڵو دەروونی جوانیو بەر لە وتەکانی، بە هەستو سۆزی بێ وێنەی لە ئامێزی گرت و پێی گوت: ئەوە چیتە ڕۆڵەی شیرینم؟! بە خودا نامەوێت بۆ ساتێکیش بە ئازارو خەمەوە بتبینم.. هێزی هەناوم، ڕووناکی چاوم، پێم بڵێ کێ پەستی کردویت؟ بۆچی هۆن هۆن فرمێسك دەڕێژیت؟

منداڵەکە بە دەم گریانەوە گوتی: دایەگیان، چیدی بۆ قوتابخانە ناگەڕێمەوە.. چونکە ئەمڕۆ مامۆستا لە بەرچاوی هاوڕێو هاوپۆلەکانمدا پێی گوتم: تۆ منداڵێکی گێلو مێشکپووتو بیرکۆڵیت، کەڵکی هیچت نییەو هیچ فێرنابیت.

دایکەکە بە چمکێکی کراسەکەی، فرمێسکی جگەرگۆشەکەی سڕی.. بە لێزمەی سۆزی ڕوومەتەکانی ماچکردو پێی گوت:

ڕۆڵەی شیرینم هیچ نییە.. چونکە هێشتا ئەوان بەهرەو توانای تۆیان نەدۆزیوەتەوە.. تا ئێستەش زرنگیو زیرەکییەکەی تۆیان بۆ دەرنەکەوتووە.. زۆری پێ ناچێت، تێگەیشتوویی و پێگەیشتوویی تۆیان بۆ دەردەکەوێت.

دایکەکە یاری لەگەڵدا کردو هێوری کردەوە، ورەی دایەوە بەرو هانی دایەوە.. تا وای لێهات شکاندنو قسەپێگوتنی مامۆستای لە بیرچوویەوەو دیسانەوە بەرەو قوتابخانە گەڕایەوە.

پاش سێ مانگ، منداڵەکە بە ئازارو خەم و تێکشکاوی زۆرترەوە هاتەوە.. ژیر نەدەبوویەوەو فرمێسك لە کانگەی چاوییەوە جۆگەلەی بەستبوو.. چونکە بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی، بە یەکجاری ئەوی لە قوتابخانە دەرکردبوو.

دایکەکە دەستی منداڵەکەی گرتو لەگەڵ خۆیدا بەرەو قوتابخانەکەی برد.. پرسیاری لە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە کرد: بۆچی بڕیاری دەرکردنی منداڵێکی شەش ساڵانەتان دەرکرد؟

بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بە تووڕەییەکەوە وەڵامی دایەوە:

منداڵەکەت هەتا بڵێیت بیرکۆڵو گێلو دەبەنگە.. قوتابخانەکەشمان بۆ ئەو کەسە دانەمەزراوە!

ئەم ژینە چەندە سەختو تاڵ دەبێت، کاتێك ددانی لە کەسێك جیڕ دەکاتەوە.. لەوەش سەختو تاڵتر ئەوەیە: بە ڕووی منداڵێکدا کە هێشتا شەش ساڵانە، ڕووی گرژو ترش بکات.

دایکەکە منداڵەکەی لە ئامێز گرتو بەرەوماڵەوە گەڕانەوە.. لە دڵی خۆیدا بڕیاری کارێکی لێبڕاوانەی دا.. بە جگەر گۆشەکەی خۆی گوت: ڕۆڵەی شیرینم، با هەموو خەڵکی دنیاش، حاشا لە بلیمەتیو زرنگیو زیرەکی تۆ بکەن.. بەڵام ئەوەندە بەسە کە من دان دەنێم بەوەی کە تۆ منداڵێکی باشوبلیمەتو زرنگو زیرەکیت.. خەڵکی چی دەڵێن با بڵێن، تەنها ئەو شتە باشە ببیستە، کە من پێت دەڵێم: (تۆ زیرەکترین منداڵی ئەم جیهانەیت)!

دایکەکە لەگەڵ هەموو سروەی سپێدەیەکدا، ئەو وتەیەی بە گوێی منداڵەکەیدا دەدایەوە.. هەڵبەتە دایکەکە هەر بەو وتەیە ڕازی نەبوو.. بەڵکو ئەرکی فێرکردنی جگەرگۆشەگەی گرتە ئەستۆی خۆی.. مامۆستای بۆ منداڵەکەی گرتو لە ماڵەوە وانەیان پێ دەگوت. هەروەها بەشێك لە داهاتی ڕۆژانەی لا دەدا.. بۆ کڕینی ئەو شتەی منداڵەکەی، بۆ فێربوونو تاقیکردنەوە پێویستیەتی.. لەم کارەشی شەکەتو پەست نەبوو.. بەڵکو دڵخۆشیی منداڵەکەی، پاڵنەرێکی بەهێز بوو، بۆئەوەی خەرجی زۆرتری بۆ بکێشێت.

منداڵەکە گەورەبوو.. پاش تێپەڕبوونی بیست ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوەدا، هەموو جیهان باسو ستایشی ئەو بلیمەتەیان دەکرد.. کە جیهانی ڕووناك کردەوە.

ئایا ئێستە دەزانن ئەو منداڵە کێیە؟؟

ئەو منداڵە ئەدیسۆن بوو.. داهێنەری گڵۆپی کارەبایی.. ئەو ئەدیسۆنەی کە بووە هۆی ڕووناککردنەوەی هەموو جیهان...

لە مێژوودا ئەدیسۆن دووەمین کەسە کە زۆرترین داهێنانی هەبێت.. ئەو ئەدیسۆنەی بە بیانووی ئەوەی گێلوبیرکۆڵە، گەمژەو تەممەڵەو خوێندنی پێناکرێت.. لە قوتابخانە وەدەرنرا.

ئەدیسۆن لە بارەی دایکەوە دەڵێت: پاکترین بوونەوەری سەر ئەم ڕووی زەمینەیە. بەڵێ.. هەر بەو جۆرەیە.. چونکە ئەدیسۆن پەروەردەی دەستی دایکی بوو.. هەروەك ناپلیۆنیش دەڵێت: لە پشت هەر پیاوێکی مەزنەوە، ئافرەتێکی مەزن هەیە.. لەبەرئەوەی دایکی ئەدیسۆن پاڵپشتی منداڵەکەی خۆی کرد.. هۆکاری سەرەکی ڕووناککردنەوەی دنیاش، بۆ دایکی دەگەڕێتەوە.

ئێستە دەپرسین: ئەگەر دایکی ئەدیسۆن وتەی مامۆستاکانی منداڵەکەی پشتڕاست بکردایەتەوە.. چی ڕووی دەدا؟!

دایك و باوکی خۆشەویست:

تەنها.. بڕواو متمانەتان بەو هێزو وزەیەی منداڵەکەتان هەیەتی.. هەروەها بەرنامەڕێژیو بڕیاردانتان بۆ دەرهێنانی تواناو بەهرە شاراوەکانی.. یەکەم هەنگاوە بۆئەوەی منداڵەکەتان ڕێرەوی مرۆڤایەتی بگۆڕێت.. ئەوەش لای خوا زۆر ئاسانە.

# چۆن دەتوانیت سەرنجڕاکێش بیت؟

ئا: بێگەرد فارس

زۆرێک ئارەزووی ئەوە دەکەن کە سەرنجی کەسانی تر بۆ لای خۆیان ڕابکێشن‌و گوێبیستی ستایشکردن بن، ئەمەش سیمایەکە لە سیماکانی ژیان، لەوانەیە کەسێکی جوان سەرنجڕاکێش بێت، بەڵام ئەو جۆرە جوانییە وەك خۆڵەمێش لە هەوادا بە با دەدرێت ئەگەر جوانی ڕۆح هاوڕێی نەبێت، گرنگترین شت لە جوانی ڕۆحدا کێشکردنی سەرنجی ئەو کەسانەیە کە ڕۆژانە لە دەوروبەرمان دان‌و مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین، ئەو ئاکارانەی کە دەبنە مایەی ڕاکێشانی سەرنجی کەسانی تر بریتین لە:

یەکەم: نەدرکاندنی کێشە تایبەتییەکان: خەم‌و خەفەت‌و نارەحەتی، چەند توخمێکن لە بنەڕەتەوە لە مرۆڤەکاندا بوونی هەیە، مرۆڤ کاتێك ڕووبەڕووی ناخۆشییەکان دەبێتەوە ناتوانێت بە خێرایی هەمووی بنەبڕ بکات‌و لە ناویان بەرێت، بەڵام دەتوانێت بیان شارێتەوە، یان بە پێی توانای خۆی کەمیان بکاتەوە بۆ ئەوەی کەسانی تر بێزار نەکات، چونکە ئەوان ناچار نین بەشداری ئەو خەمە بن.

دووەم: تێگەیشتن لە خەڵك لە بارودۆخەکانیاندا: تێگەیشتن‌و هەستکردن، یاخود خوێندنەوەی هەستی بەرامبەر، بۆ نموونە کاتێك کەسێك بێزار، یان نەخۆش، یان دڵتەنگ دەبێت، پێویستە بەشێوەیەك مامەڵە بکەین کە نەبێتە زیاتر ئازاردانی‌و نارەحەت کردنی، بەڵکو هەماهەنگ بین لەگەڵ بارودۆخی ئەودا، یاخود ئەگەر دڵخۆش‌و ئاسوودە بوو ئێمەش دڵخۆش بین‌و هاوبەشی بین لە هەموو بارەکاندا... واتە ڕێزی خەم‌و خەفەتیان بگرین‌و بە خۆشییەکانیان ئاسوودە بین.

سێیەم: هونەری گوێگرتن:

گوێگرتنت بۆ کەسانی تر بە جوانترین شێوەو بەکارهێنانی هونەرو ئەتەکێتی گوێگرتن، کاتێك کەسێك گفتوگۆمان لەگەڵدا دەکات پێویستە خەیاڵ نەمان باتەوەو ئاگامان لەو بێت، بۆ ئەوەی هەست بەوە نەکات گرنگی بە وتەکانی نادرێت، قسەی پێ نەبڕین‌و بەشێوەیەك گوێی بۆ بگرین هەست بەوە بکات مەبەستمانە تا دوا وتە لەگەڵیدا بین‌و بە ڕوویەکی گەشەوە بەو شێوەی کە بۆ خۆمان پێمان خۆشە ئازادی بدەینێ‌و بەشداریش بین لە گفتوگۆکردن‌و وەڵامدانەوە دوای تەواو بوونی.

چوارەم: خۆ بە کەمدانان: هەندێك کەس لایان وایە لە هیچ شتێکدا لە کەسی تر کەمتر نین‌و زۆر بێ کەم‌و کوڕین، تەنانەت ئەگەر هەست بکەن کەسێك لەو زیاتر بێت، لە هەڵس‌وکەوت‌و دەربڕینییان دا دەردەکەوێت کە کاریگەربووەو پێی ناخۆشە، ئەو ڕەوشتە دوورە لەو کەسانەی لە کۆمەڵدا خۆشەویستن، بۆ ئەوەی لە ناو کۆمەڵگەدا خۆشەویست بین، پێویستە خۆمان بە کەم بزانین‌و هەرگیز بەجۆرێك مامەڵە نەکەین بەرامبەر لێمان دوور بکەوێتەوە.

پێنجەم: دەرخستنی سەرسامبوون: هەموو کەسێك پێی خۆشە کە ستایش بکرێت، بە مەرجێك لە سنوری خۆی دەرنەچێت‌و دوور نەبێت لە ڕاستییەوە، کەسەکان پێویستیان بەو ستایشە هەیە کە دەبێتە مایەی تازە بوونەوەی متمانەیان بە خودی خۆیان، بەڵام باشتر وایە ئەو دەربڕینی سەرسامبوونە بە وشەیەك بێت‌و لە کاتی گونجاوو ڕێگەیەکی گونجاودا بێت.

جا بۆیە هەوڵ بدە ئەگەر ئاکاری جوانت بەدی کرد لە بەرامبەردا، ئەوا ستایشی بکەو سەرسامی خۆتی بۆ دەربخە.

شەشەم: گەشبینی: کەسی گەشبین هەمیشە خۆشەویستە، وا لە کەسانی تر دەکات واقیعیانە بۆ جیهان بڕوانن، بەڵام پێویستە ئەو گەشبینییە نەگاتە سنوری ئەندێشەو خەیاڵ، گەشبین دان بە نائومێدی دا نانێت، بەڵکو هەمیشە بۆ چارەسەری کێشەکانی هیوای نوێ دەکاتەوە لە سنووری تواناکانی خۆیدا، هەمیشە هیوا دەبەخشێتە دڵە نائومێدەکان‌و داڕوخاوەکان، هەربۆیە کەسانی گەشبین خۆشەویستن.

حەوتەم: قبوڵکردنی ڕەخنە بە سنگێکی فراوانەوە: باش وایە ڕەخنەو بۆچوونەکانی کەسانی دەوروبەرمان بە سنگێکی فراوانەوە وەربگرین بە تایبەتی ئەگەر کەسانی دڵسۆز بن‌و مەبەستیان یارمەتیدان بێت، هەندێجار لە لایەن کەسانێکەوە ڕەخنەی ڕووخێنەر بەرەو ڕووت دەبێتەوە، بەڵام باش بێت، یان خراپ، چاکتر وایە لە هەردوو بارەکەدا ئەو ڕەخنەو تێبینیانە بە زەردەخەنەیەکەوە وەربگرین‌و هەڵنەچین، یاخود لەو کەسانە نەبین خاوەنی ڕەخنەی بریندارکاوی‌و ئازاردەرن، تێڕوانینی گاڵتەئامێزمان نەبێت تا بتوانین کەسێکی خۆشەویست بین.

هەشتەم: بیرکردنەوەو مامەڵە کردن بە نیازی باشەوە:

بۆ ئەوەی کەسێکی سەرنجڕاکێش بیت پێویستە هەمیشە بە نیازی باشەوە مامەڵە بکەیت، تەنانەت ئەگەر خاوەنی هەموو ئاکارەکانی سەرەوە بیت، بەڵام ئەگەر کەسێك بیت دوور بیت لە هەڵس‌وکەوتی جوان‌و باشەوە، ئەوە تۆ یەکێك لە سیفەتە جوانەکانی سەرنجڕاکێشانت لە دەست داوە.

نۆیەم: ڕاشکاوی: ڕاشکاوی سیفەتێکی بنەڕەتییە لە کەسانی سەرنجڕاکێشدا، سەرەتا پێویستە ڕاشکاو بیت لە بیرکردنەوە لە خودی خۆت، لە گەشبینیدا لەگەڵ خەڵك، بەڵام ژیان‌و مامەڵە کردن هەرجارەو بە جۆرێك لەگەڵ خەڵکدا.

## ڕاهێنانی

# مێشك

به وردی لەم وێنەیە ورد بەرەوەو
هێزی مێشكو بیركردنەوەت بخەرە كار
بزانە چی دەبینیت؟ تا چ ڕادەیەك دیدی تێڕوانینت وردە؟

پەری شێخ کەریم

# خۆهەڵقورتاندنی کەسوکار، ژیانی هاوسەرێتی دەروخێنێت!

*نهێنی خۆهەڵقورتاندنی دایکی کوڕو کچ چییە لە ژیانیاندا؟

* ئایا ئـەم کارە دەبێتە مایەی تێکدانی ژیانی هاوسەرییان، یان بە پێچەوانەوە؟

* خۆهەڵقورتاندنی کەسـی هاوسەر لە ژیانی هاوسـەریدا، ئایا نیشانەیە لەسەرلاوازی کەسایەتی پیاو؟

* لـە چ کاتێکـدا پێویسـتە کەسـوکار دەسـتوەربدەنە نێـو کاروبـاری کـوڕو کچەکانیان؟

* ئایـا خۆهەڵقورتانـدن بووەتە مایەی لێك جیابوونەوەی هاوسەران، یان گۆڕانکاریو سەرکەوتنیان؟

هەریـەك لە ئێمـە کاتێـك دەچینە نێو ژیانـی هاوسـەرییەوە، خـەون دەبینیـن بە ژیانێکی ئاسـوودەوە پڕ بێت لە سـەلامەتیو دڵخۆشـی، بـەڵام بەداخـەوە هەندێجـار ئەم ئاسودەییە بەهۆی نەزانی هەندێ کاری هەڵەوە دەشـێوێت. ئەویش بە هۆی خۆهەڵقورتاندنی کەسـانی دەوروبـەر لـە تایبەتمەنـدیو کێشەکانماندا، کە دەبێتە زیاتر دروستبووونی کێشـەو ناکۆکـی، زۆرجـار خۆهەڵقورتاندن لەبەر کەسـی بەرامبەر ئەنجام دەدرێت، بەڵام بەپێچەوانـەوە دەرەنجامـی خراپـی دەبێت، ناڕەحەتییەکـی دەروونی لە نێوان کەس‌وکارو هەردوو هاوسـەردا دروسـت دەبێت تووشـی دوودڵـیو گومان دەبـن لە یەکتـری. لێرەدا دەتوانیـن بڵێیـن: خۆهەڵقورتانـدن زیاتـر لـە لایەن دایکەوە دروسـت دەبێـت، بە هۆی دڵسـۆزییەوە بۆ کچو کوڕی، ئـەو نهێنییەش چییە کەهەمیشە دایك لە دوای هاوسەرگیری کچو کوڕەکەی حەز دەکات بە هەموو خۆشیو ناخۆشـییەکانیماڵی کـچو کوڕەکەی بزانێت لـە هەموو بوارەکانی ژیانیان دەپرسـێت، ئایا دەزانێـت ئەو خۆهەڵقورتاندنە دەبێتە مایەی کێشـە، یا بە پێچەوانەوە بۆ خۆشـحاڵی کچو کوڕەکەیەتی؟

زۆرجار دەبیستین ناکۆکی دروست دەبێت بە هۆی پرسیارکردنو دەربڕینی ڕاووبۆچوونی دایك بۆ ماڵی کوڕەکـەیو کچەکەی، بۆ زیاتر تێگەیشـتنمان لـەم بابەتـە دەروونناسـانی کۆمەڵایەتی ئەمجۆرە خۆهەڵقورتاندنە دەکەن بە دووبەشەوە:

* دایك بە هۆی دڵسـۆزییەوە هەمیشـە حەز دەکات هەمـوو هەواڵێکی نێو ماڵەکەیان ئاگادار بێتو هاوبەشـییان بکات لە خۆشی و ناخۆشییەکانیاندا.

* زۆر بەداخـەوە هەندێـك دایـك کاتێك پرسـیار دەکات لە کاروبـاری ماڵی کوڕەکەی لە هەمـوو کارێکـدا هەندێ قسـەو هەڵس‌وکەوت دەکات وەك ڕقێـك لـە خێزانـی کوڕەکـەی، وادەزانێـت کوڕەکەی داگیر کراوە، یان کوڕەکەی هەموو سۆزو خۆشەویستی دایکی لە بیرچۆتەوە، یـان کاتێك پرسـیار دەکات لـە کاروباری ماڵی کچەکـەی دەروونناسـانی کۆمەڵایەتـی جەخت لەسـەر ئەوە دەکەنو دەڵێن هەمیشە کچ قسەو کەموکـوڕی نێو ماڵەکەی دەگێڕێتەوە بۆ دایکی، یا خوشـکی ئەمەش وادەکات دایك قسـە بکات لـە هەموو بوارێکی ماڵـی کچەکەیدا، بۆیە ئەم شێوازی خۆهەڵقورتاندنە زۆر بەداخەوە کێشەو زیزبوونو بێڕێزی لە نێوانیاندا دروست دەکات.

پرسـیاری دوەم: خۆهەڵقورتاندنی کەسی هاوسـەر لە ژیانی هاوسـەریدا، ئایا نیشانەیە لەسەرلاوازی کەسایەتی پیاو؟

بەڵێ بەداخەوە هەندێ هاوسەر بەجۆرێك مامەڵە دەکات کە زۆرجـار خۆهەڵقورتاندنی کەس‌وکار بەڵگەن لەسـەر لاوازی کەسـایەتی هاوسـەرەکە، چونکە بەڕاسـتی خـۆی توانای چارەسـەرکردنو جێبەجێکردنـی کارەکانـی هەبێت هیچ کەس ناتوانێت خۆی بەرپرسـیار

بکات لـە کارەکانی نێو ماڵەکەیدا، پێویسـتە لەسەر هاوسەر بەشێوەیەکی جوان بۆ دەوروبەری ڕوون بکاتەوە کە خۆی بەرپرسیارە نەك کەسی دیکە، لـەم ڕووەوە دەوروبەر تێدەگەن خاوەن کەسایەتییەکی بەهێزەو دەتوانێت ڕووبەڕووی هەمـوو کەموکوڕییـەك ببێتـەوەو ژیانێکـی ئاسوودەو سەلامەت پێکدەهێنێت بۆ ماڵەکەی خۆیو خەڵکیش دڵنیا دەکات لە ژیانی.

پرسیاری سـێیەم: لە چ کاتێکدا پێویستە کـەسو کاری کـچو کـوڕ پرسـیار بکـەن لە کاروبارەکانی نێوماڵەکەیان؟

پێویستە لەسەر هاوسەران کاتێك ڕووبەڕووی کێشـەیەك دەبنەوەو چەندجـار خۆیان هەوڵی چارەسـەرکردنیان داوە بەڵام توانـاو بۆچوونی خۆیان چارەسـەری نەکـردووە، بۆیە لەم کاتەدا پێویستە لەسەریان کەسوکاریان ئاگادار بکەنەوە، بـەڵام کەسـانی زیـرەكو ئاقـڵ هەڵبژێـرنو یارمەتیان بدات نەك کەسانێك کێشەکە ئاڵۆزتر بکەنو هەردوو هاوسـەرەکە زیاتر زیز بکەن لە یەکتـری، هـەروەك خوای گـەورە دەفەرموێت: ((وإن خفتم شـقاق بينهما فابعثوا حكما من أهله وحكما من أهلهاإن يريدا إصلاحا يوفق الله بينهما إن الله كان عليما خبيرا)).

واتـە: ((ئەگـەر ترسـتان لەناکۆکی ژنو مێردێـك هەبوو کـە پێکـەوە ناگونجێن، جا کەسێکی دادوەر لە بنەماڵەی کچەکەو کوڕەکە بنێرن بـۆ دۆزینـەوەی هەڵەکانیـان، دانانی چارەسەرێك بۆ کێشـەکانیان، ئەگەر هەردوو هاوسـەرەکە ڕازیبـوون پێکبێـن، ئـەوە خوا یەکیان دەخات، پیرۆزی دەخاتە کارەکانیانەوە، خوا ئاگادارە بە ئەحواڵی هەموو کەسێك)).

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر بەرپرسیاریەتی کەسوکار بۆ هاوسـەران تەنها بە مەبەسـتی چارەسـەرکردنەو پێویسـتە لەسەر هاوسەران تەنها لەم حاڵەتەدا باسـی کێشەو کەمو کوڕی نێو ماڵەکەیان بکەن لە لای کەسوکاریان.

بۆئەوەی هاوسـەران ژیانێکی سـەلامەت بەسـەر بەرنو دوور بن لە هەموو کێشەیەك پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەن:

* لێزانیـن لـە هەڵسوکەوتدا:بـۆ ئـەو هاوسـەرانەی کە لەسەرەتای هاوسەرگیریدانو ئەوانـەی چەنـد سـاڵێکە هاوسـەر گیرییان کردووە، پێویستە لەسەر هەردوولا بەشێوەیەك هەڵسوکەوت بکـەن لـە لای کـەسو کاریان، یا بەشـێوەیەك قسـە بکەن کە کاروباری نێو ماڵەکەیانو کەمتەرخەمییەکانیان دەرنەخەن هەتـا کـەسو کار لـە هەمـوو کاروبارێکـی ژیانیاندا پرسیار نەکەن.

*پێویسـتە لەسـەر کوڕ کاتێـك خێزان پێکدەهێنێـت ئـاگاداری ئـەرکو مافەکانـی ماڵـی باوکی بێتو وەفادار بێـت بۆیان، وەك پێویسـت ئاگاداربێت لێیان، هەتا کەسو کاری سەرزەنشتی نەکەن لە کەمتەرخەمییەکانی.

* هاوسـەر لە کاتـی بینینی کەسوکاری خۆی وەکو کەسـێکی یەکسـان دەربخات، وەك دەروونناسان دەڵێن: (توازن فی عمل والقول).

* پێویسـتە لەسـەر هاوسـەر وێنـەی خێزانەکـەی لە لای کـەسوکاری جوان بکات، واتە: هەمیشە ئەوەیان یاد بهێنێتەوە کە زۆر خۆشەویشـت و بەڕێزن لـە لای خێزانەکەیو بـە هەمـان شـێوە ئافرەتیـش هەمیشـە ڕێزو خۆشەویسـتی هاوسـەرەکەی بـۆ ماڵی باوکـی دەربخـات هەتـا هەردووخێزانی کچو کوڕەکـە خۆشـحاڵو دڵنیابن بـە ژیانی ئەم دووهاوسەرە.

پرسـیاری چوارەم: ئایا خـۆ هەڵقورتاندن بووەتـە مایەی لێك جیابوونەوەی هاوسـەران، یـان سـەرکەوتنو گۆڕانکارییـان: بێگومـان هەندێجار قسـەیەك، یا ئامۆژگارییەك دەبێتە چارەسەرکردنی کێشـەکەو بەپێچەوانەوە وەك لە سەرەتادا باسـمان کرد لەوانەیە ببێتە لێك جیابوونەوەو دابڕانی دوو هاوسەر لە یەکتری.

نموونەشـمان بۆ ئـەم باسـە: ئافرەتێك دەڵێـت: (من هەمیشـە چاکەو خۆشەویسـتی کـەسوکاری هاوسـەرەکەم لـە یـاد ناچێت، چونکە بەڕاستی یارمەتیدەرم بوون بۆ هەموو بوارێکی ژیانم، لەگەڵ هاوسـەرەکەمدا تووشی هەندێـك نارەحەتی بـووم حەزمنەکرد ماڵی باوکم بزانـن، چونکە بێگومان بـووم لەوەی کەسو کارم بە بیستنی هەر کەمتەرخەمییەکی هاوسـەرەکەم لەگەڵمـدا زیز دەبـوونو دڵیان بەرامبەر هاوسـەرەکەم دەگۆڕا، هەمیشـە لە بیریان نەدەچوو، بەڵام سوپاسی دایکی دەکەم کە کێشەکەی بە بێدەنگ بۆ چارەسەر کردم).

بەڵام بەداخـەوە هەندێجار هەڵقورتاندن بە بیرکردنەوەیەکی هەڵانە بە قسـەکردنێکی خـراپ دەبێتـە لێکجیابوونەوەی هاوسـەران، نموونەشـمان بـۆ ئـەم بابەتـە: بەداخـەوە بەپێچەوانـەی چیرۆکی یەکەمـە، ئافرەتێك دەڵێت: (هەر کات تووشـی کەمتەرخەمییەك، یان کێشەیەك دەبووین، من ڕاستەوخۆ لە لای کەسوکارم باسـم دەکردو هاوسەرەکەم لەبەر دڵنارەحەتـی خۆی لە لای کەسوکاری باسـی دەکـرد، بۆیە ژیانی هەردوولامان بە دەسـتی کەسوکارمـان بەڕێـوە دەچوو، بەشـێوەیەك هەمـوو ژیانمـان پڕبوو لە تانەوتەشـەر، من هیـچ ڕێزێکـم نەمابوو لە لای کـەسوکاریو هاوسـەرەکەم بە هەمان شـێوە، کـەسوکارم تەنانـەت حەزیان بە بینینـی نەدەکرد، بۆیە لـە کۆتاییدا هەموو ئـەم هۆکارانە وایکرد لە جیاتی باسکردنی کێشەکانمان لە لایان بۆمان چارەسـەر بکەن، بەپێچەوانـەوە لە یەکتری جیابووینەوە، بۆیە لە کۆتاییدا دەڵێم خۆمانو منداڵە چاو گەشەکانمان بووینە قوربانی قسە

# ژیان فێری کردم

- ژیان فێری کردم: زۆرێك لە خەڵکی ئامۆژگاری دەکرێن، بەڵام کەمێکیان سوودی لێ دەبینن!

- ژیان فێری کردم: کە هیواو ئاواتەکان بە دەست نایەن، بەبێ دەردەسەریو ماندوبوون.

- ژیان فێری کردم: کاتێك کەسانی زیرەك دەخەیتـە کار، دەگەیتە هیـواو ئامانجەکانت، بەوەش دەیسەلمێنیت کە تۆ لەوان زیرەکتری!

- ژیـان فێری کـردم: زۆربەی سـاتەکانی بەختـەوەری لـە ژیانـدا، ئـەو سـاتانەن کە دەتوانیـت ئەو شـتانە بە دەسـت بهێنیت کە خەڵکی دەڵێن، هەرگیز ناتوانیت ئەو شتانە بە دەست بهێنیت.

- ژیـان فێـری کردم: ئـەو کەسـە ئازاو بوێرانـەی لـە ڕووبەڕووبوونـەوەی شکسـت ناترسـن، ئەو کەسـانەن کە زاڵ دەبن بەسـەر هەموو کارە سـەنگینو سـەختەکاندا، پاشـان سەرکەوتن بە دەست دەهێنن.

- ژیان فێری کردم: شکستخواردن خراپترین شـت نییە لـەم جیهانـەدا، بەڵکـو خراپترین شکستخواردن ئەوەیە کە تاقی ناکەینەوە.

ژیان فێری کردم: مرۆڤ (٣) کاتژمێر زووتر بگاتە سەر کارەکەی، چاکترە لەوەی تەنها یەك خولەك دوابکەوێت.

- ژیان فێری کردم: گرنگ نییە کە شکست دەهێنیـتو دەکەویـت، بەڵکو گرنـگ ئەوەیە کـە ئایـا دەتوانیت لـە دوای کەوتنو شکسـت هەستیتەوە؟

- ژیـان فێـری کـردم: کە شکسـتخواردن هەلێکـی نوێیە بـۆ دەسـتپێکردنەوەی جاری دووەم بە زیرەکیو لێهاتوویەکی باشتر.

- ژیـان فێـری کـردم: لـە کۆتاییـدا هەر ئـەو کەسـە سـەردەکەوێت، کە توانـای خۆڕاگریو ئارامگرتنی هەیە.

- ژیـان فێـری کـردم: پێویسـتە مرۆڤ بەردەوام لە خۆی بپرسـێت کـە هیواو ئاواتو ئـارەزووی لـە چییە لـەم ژیانەدا بە دەسـتی بهێنێـت؟ ئەگەر زانیت، ئـەوا هیچ بوارێك بۆ شکست نامێنێتەوە.

- ژیان فێری کردم: لە هەر بارودۆخێکدایت، بە ڕوویەکی خۆشـەوە پێشـوازی لە ژیان بکە، فێـری زەردەخەنەو پێکەنین بـە، خەمەکانی جیهان مەدە بە کۆڵی خۆتدا!

# باشترین بڕیار

و/ ڕاز هەڵەبجەیی

دانیشتبووم خەریکبووم پارەکانم دەژمارد، لــەو کاتەدا دەنگی پێی دایکمم بیســت بەرەو ژوورەکــەم دەهــات، بە خێرایــی پارەکانم لە ژێر ســەرینەکەمدا شاردەوەو بە ساردییەکەوە سەیری دایکمم کرد کە هاتبووە ژوورەکەمەوە، دایکیشم بە گومانێکەوە سەیری کردمو وتی:

خەریکی چی بوویت؟

منیــش وتم: هیــچ، دەبێت بــۆ هیچیش مۆڵەت لە ئێوە وەربگرم؟

ڕووخســاری دایکم گۆڕاو وتی: من نازانم تــۆ لە کــێ دەچیت وا ئەوەنــدە ڕووداری، بە هەرحاڵ هاتم پێت بڵێم کە سبەینێ مەهدیو خانەوادەکــەی دێنــە ئێــرە بــۆ خوازبێنیت، توخوا ئیتــر واز لەم کارە منداڵانەیەت بێنەو ئابڕوومان مەبە، ئەگەریش ناتەوێت زەماوەند لەگەڵ مەهدی بکەیت، کەس زۆرت لێ ناکات، بەڵام بهێڵە با دراوســێکان بزانن کە تۆ هێشتا داواکارت هەیــەو بەڵکــو لە شــەڕی ئەو کوڕە نەگبەتەش ڕزگارمان بێت. دەزانیت ئەم جارە باوکت ســوێندی خــواردووە ئەگــەر یاری بە ئابــڕوی بکەیت دەتنێرێت بــۆ لادێ بۆ ماڵی پورت تا ئیتر چاوت بە شــارو بە هاوڕێکانت نەکەوێت.

بە پۆزێکەوە پێکەنیمو وتم: مەگەر ئێستا دەیانبینم؟

دایکــم بــە توڕەییەوە وتــی: دەنگت نزم بکەرەوە، دەتەوێت کێشــە دروست بکەیت؟ تۆ ئەگــەر کەمێك دڵ بە دڵی منو باوکت بدەیت دەزانیت کە ئێمە چاکەی تۆمان دەوێت.

لــە کاتێکدا کــە بــە ئەنقەســت دەنگم بــەرز دەکردەوە بۆ ئــەوەی باوکیشــم گوێی لــێ بێت وتم: باشــی من لەوەدایــە کە خۆم چارەنووسی خۆم دیاری بکەم، بەڵام چی بکەم خۆ چارەیەکم نییە دەبێت بە ئارەزووی ئێوە بجوڵێمەوە.

دایکــم بە چاوێکی پڕ لە سەرزەنشــتەوە ســەیرێکی کــردمو بێ ئەوەی هیــچ بڵێت لە ژوورەکــەم چــووە دەرەوە، دوای ڕۆیشــتنی دایکم خێرا پارەکانم دەرهێناو دەســتم کرد بە ژماردنــی، پارەیەکی زۆر نەبوو، بەڵام بە فرۆشــتنی ئاڵتوونەکانیشم دەبوویە پارەیەکی بــاشو دەیتوانی گرێیەك لە کێشــەکانی منو کامــەران بکاتــەوە، لە کاتێکدا کــە پێکەنینم بە قســەکانی دایکمو باوکم دەهات بە خێرایی پارەکانــمو ئاڵتوونەکانــمو ناســنامەکەم لــە جانتاکەمــدا هەڵگــرتو دوایــش بــە ئارامی ڕۆیشــتمە ژێر بەتانییەکەوە، شێوەی کامەران هەمیشە لە پێش چاوم بوو بەیانی هەردووکمان بــۆ هەمیشــە لــەم شــارە ڕامان دەکــردو بە خەیاڵێکــی ئاســودەوە لــە تــاران دەبووینــە هاوســەری یەکتریو لەوێ ئیتر پێویســتم بە ڕازیبوونی باوکم نەبوو، دەمتوانی لەگەڵ ئەو کەســەی کە خۆشم دەوێت بە هەرجۆرێك کە حەزم لێیە بژیم.

نیوەشــەو بوو لەخەو هەستام، ماڵەکە بە تەواوەتی بێدەنگ بوو، بە ئارامی خۆم گۆڕیو جانتاکــەم هەڵگرتو لە تەنیشــتی ژوورەکەی دایکــمو باوکمــەوە ڕۆیشــتم، نازانــم بۆچی ساتێك حەزم کرد بۆ دواجار سەیرێکی دایکمو باوکم بکەم، بە هێواشی دەرگای ژوورەکەیانم کردەوە، بەڵام بینیم جێگەکەی باوکم خاڵییە سەرم سوڕما، یانی ئەو بەم نیوەشەوە لەکوێیە؟ لە کاتێکدا هەوڵم دا کە کەس گوێی لە دەنگی پێــم نەبێت لــە قادرمەکان هاتمــە خوارەوە دەرگای ژووری میوانەکــە نیــوە کراوەبــوو ڕووناکییەکیش لەوێوە دەهاتە دەرەوە، چومە پشــت دەرگاکەو لە لایەکی دەرگاکەوە سەیری نــاو ژورەکــەم کــرد، باوکم لەســەر بەرماڵی نوێژەکە دانیشــتبوو، پشتی لە من بوو، لەگەڵ خــودا ڕازو نیازی دەکرد، بەڵام من بە باشــی دەمتوانی گوێم لە گریانو پاڕانەوەکانی بێت، باوکم دەیگوت:

خوایە من منداڵەکانم بە ئابڕوو پەروەردە کردووەو ئارەزووی من خۆشبەختی ئەوانە، زیبا کچی گەورەی منەو جێگای لە دڵی مندایە، من ناتوانم زۆری لێ بکەم کە لەگەڵ کەسێکی تر زەماوەند بــکات، هەرچەندە لە ناخی دڵمەوە دەزانــم کە کامــەران بە کەڵکی ئــەو نایەت، خۆت دەزانیت کە ئــەم کوڕە چەندجارێك لە قاســەکەی من دزی کردووەو لە کۆڵانەکەشدا ژنو کچــی خەڵکی بێزار کــردووە، چەندجار هەوڵمدا کە ڕێگای ڕاستی پیشان بدەم، بەڵام بێ سودبوو، سەرەنجام ناچاربووم لــە دوکانەکەم دەری بکەم، خوایــە من نامەوێت ئابڕووی ئەم کوڕە لە بە ر چــا و ی کچەکەم ببەم، بهێڵــە ئەو بیــر بکاتــەوەو بزانێــت کــە مــن لــەڕووی دوژمنایەتییــەوە کامەرانــم لــە دوکانەکــەم دەرنەکردووە، هەرچەندە ئەگەر ئەمە بە زیبا بڵێم باوەڕناکات، خوایە ئومێدم بە تۆیە، خۆت بە جۆرێك خۆشەویســتی ئەم کوڕە ناپاکە لە دڵی کچەکەم دەربهێنــەو مەهێڵە لەبەرچاوی دراوسێکانم ئابڕووم بەرێت.

بــە بیســتنی ڕازو نیازەکانــی باوکــم بە لەشێکی ساردەوە بە ئارامی گەڕامەوە ژوورەکەمو لەســەر جێگاکەم پاڵکەوتــم، باوەڕکردنی ئەو قســانەی کە بیستم بۆ من کێشــە بوو، باوکم ڕاســتی دەکرد ئەگــەر ئەو قســانەی بە خۆم بووتایە مەحاڵ بوو باوەڕ بکەم، بەڵام ئێســتا کە قســەی خۆی لەگەڵ خــودا دەکردو منیش بە نەویســتراوی گوێم لە قسەکانی بوو، دڵنیا بووم کە ئەو ڕاستییەکەی دەڵێت.

ســەیری کاتژمێرەکەم کــرد دەمزانی کە ئێســتا کامــەران هاتووەتــە ســەر کۆڵانەکەو چاوەڕێم دەکات، بێگومان لە خۆی دەپرســێت بۆچی زیبا نەهات؟ هەر بەم بیرکردنەوەیەوە لەســەر جێگاکەم ڕاکشــام، دەبوایە بەخێرایی بڕۆشــتمایە، چونکە لەوانەبوو پاسەکە بەڕێ بکەوێتو بەجێمــان بهێڵێت، بەڵام یەکســەر قســەکانی باوکــمو نزاکانــی شــەوانەی ئەوم بیر دەهاتــەوەو ئیدی پەشــیمان دەبوومەوە، خوایە چــی بکەم؟ ئەگەر کامەران بەڕاســتی دەست پیسو ناپەسەند بێت، تەواوی قسەکانی درۆی ڕەنگاوڕەنــگ بێــت، بــەم ڕاکردنە بێ عەقڵانەیــەم تــەواوی دەرگاکان لەســەر خۆم دادەخــەم، چەند جار لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا چیرۆکــی ئــەو کچانــەم خوێندبوویــەوە کە لەمــاڵ ڕایــان کردووە، بەڵام خۆشــم دڵخۆش دەکرد بەوەی کە چیرۆکی من جیاوازەو جگە لە ڕاکردن ڕێگایەکم بــۆ نەماوەتەوە، چونکە باوکم بە هیچ شــێوەیەك ڕازی نابێت کە من لەگەڵ کامەران زەماوەند بکەم، دەیگوت ئەگەر کامەران مەبەستی کاری خێربووایە هــەر لــە ســەرەتاوە بە نهێنــی پەیوەنــدی لەگــەڵ تــۆ نــە

دەبەستو مێشکی تۆی تێك نەدەداو زۆر پیاوانە دەهاتە پێشەوە بۆ لای منو خوازبێنی دەکردیت.

ئەو شەوە تا بەیانی خەو نەچووە چاوەکانم، هەرجۆرێك بوو توانیم بڕیارێکی گرنگ بدەم بە خۆم وت: کە بە جێبەجێکردنی ئەم بڕیارە بۆ هەمیشە هەموو شتێك لە مێشکم پاك دەکەمەوە، نزیکی نیوەڕۆبوو کە لە خەو هەستام نازانم کەی خەوم لێ کەوتبوو، لە خوارەوە دەنگە دەنگێك بەر گوێم دەکەوت وا دیاربوو میوانمان دەهات، دایکم خەریکبووماڵەکەی ئامادە دەکرد بۆ خوازبێنییەکەی من کە دوای نیوەڕۆ بوو، بە هێواشی چوومە سەر قادرمەکانو سەیری خوارەوەم کرد چاکەتەکەی باوکم لەوێ نەبوو، وا دیاربوو باوکم لەوێ نییە هەناسەیەکی ئیسراحەتم هەڵکێشاو گەڕامەوە ژوورەکەمو چاوەڕێی تەلەفۆنی کامەران بووم، چاوەڕوانییەکەم زۆری نەخایاند کامەران تەلەفۆنی کرد وتی: لە تەلەفۆنی گشتییەوە قسە دەکەم ئاخر ژاوەژاوێك لە دەوروپشتی هەبوو بە دەنگێکی لەسەرخۆ وتی: زیبا چی بووە؟ بۆچی نەهاتیت؟ دەتوانیت قسە بکەیت؟

هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشاو وتم: چونکە ئیتر پێویست بە ڕاکردن ناکات!

کامەران بە سەرسوڕمانێکەوە وتی: مەبەستت چییە؟ دەتەوێت بڵێیت پەشیمان بوویتەوە لەوەی کە لەگەڵ من بێیت؟

لە کاتێکدا هەوڵم دا بە دەنگم وا نیشان بدەم کە خۆشحاڵم وتم: نا مەبەستم ئەوە نەبوو ڕاستییەکەی باوکم ڕازی بووە کە ئێمە زەماوەند بکەین پێکەوە، دوێنێ شەو خۆی هاتە ژوورەکەمو پێی وتم کە بە زەماوەندەکەتان ڕازیم، جارێ نافەرمانییەکانی من ماندووی کردووە، ئەو وتی: کە هەر ئەمڕۆ دوانیوەڕۆکەی بێیتە ماڵی ئێمە تا قسەت لەگەڵ بکات.

کامەران بە خۆشحاڵییەوە وتی: بەڕاستتە؟ چەندە هەواڵێکی خۆشە!

لە کاتێکدا کە قسەکەیم بڕیو وتم: ئەو ئامادەیە کە ئێمە هەر سبەینێ پەیمانەکە ببەستین، بەڵام مەرجێکی بۆ داناوین.

کامەران بە توندییەوە پرسی: چ مەرجێك؟

بە خۆشحاڵییەوە وتم: مەرجەکەی ئەوەیە کە من هەموو میراتەکەم ببەخشم واتە هیچ شتێك لە سامانی ئەو بە من نەگات، هەر بۆ ئەم مەبەستەش دەیەوێت هەموو میراتو سامانەکەی بکات بەناوی خوشکەکەمەوە.

باوکم وتی: ئەگەر ئەم مەرجە قبوڵ بکەن دەتوانن هەر لەم شارەدا بمێننەوەو هاتوچۆش لە نێوانماندا هەبێت.

کامەران دوای بێدەنگییەکی زۆر وتی: بەڵام ئەو سەروەتە مافی تۆشە، باوکت ناتوانێت تۆ لە مافی خۆت بێبەش بکات.

بەبێ دوودڵی وتم: سەروەتی باوکم بۆ من گرنگ نییەو ئامادەم لەبەر خاتری تۆ واز لەو مافەی خۆم بهێنم، خۆ تۆش هەمیشە دەتگوت گرنگی بە پارەکانی باوکم نادەیتو من بۆ تۆ گرنگم.

کەواتە باشتر وایە ئەم مەرجە قبوڵ بکەینو لە جیاتی ئاوارەبوونمان هەر لەم شارە بمێنینەوەو لەسەر پێی خۆمان ڕاوەستینو پێکەوە بە ئاسوودەیی بژین. گفتوگۆ تەلەفۆنییەکەی من لەگەڵ ئەو بە بیستنی دەنگی دایکم کە لە خوارەوە بانگی دەکردم پچڕا.

دەمزانی لە دڵی کامەراندا ئاشوبێکی خراپ بەرپا بووە، چونکە ئەو زیاتر لە هەموو کەسێك باوکمی دەناسیو دەیزانی ئەگەر بڕیارێك بدات، دەیباتە سەر.

لێدانەکانی دڵم زۆر زیادی کرد، نەمدەزانی ئایا کامەران لەسەر بەڵێنو پەیمانەکانی خۆی سورە، یان نا؟!

بەڵام دیار بوو باوکم لە من باشتر ئەوی دەناسی، چونکە لەو ڕۆژە بە دواوە تەنانەت تەلەفۆنیشی نەکرد، ئەو شەوە مەهدیو خانەوادەکەی هاتن بۆ خوازبێنیم، ماڵی ئەوان دوو کۆڵان لە خوار خۆمانەوە بوو، دایکی ئەو لە مێژبوو بوو دایکمی دەناسی، مەهدی کوڕێکی باشبوو، تازە خوێندنی زانکۆی تەواو کردبوو، لە کۆمپانیایەکدا کاری دەکرد، ئەو بە پێچەوانەی کامەرانەوە چاوی لێ سوور نە دەکردمەوەو هەمیشە سەری دادەخست، ئەگەر کامەران لە ژیانمدا نەبووایە یەکسەر ڕازی دەبووم زەماوەندی لەگەڵدا بکەم، بەڵام هێشتا هەر ئومێدی گەڕانەوەی کامەران لە دڵمدا مابوو.

ڕۆژانی دوایی زۆر بە خێرایی تێپەڕی، بەڵام هیچ هەواڵێك لە کامەران نەبوو، مەهدی چەند جارێکی تریش هاتەوە خوازبێنیمو منیش ڕازی بوونی خۆم بۆ زەماوەند لەگەڵیدا ڕاگەیاند.

ئێستا ئیتر دڵنیابووم کە کامەران لەبەر پارەو سامانی باوکم منی دەویست، هەر لەبەرئەوەش بوو هەمیشە دەیگوت: کە لە شەوی ڕاکردنەکەماندا ئاڵتونەکانی دایکیشم لەگەڵ خۆم ببەم، ئەو پارەو ئاڵتوونەکانی منی لا گرنگ بوو نەك خۆم!

بەڵام مانگی سێیەمی زەماوەندمان ناچار بووم هەموو شتێك بە هاوسەرەکەم بڵێم، ماوەیەك بوو چەند کەسێکی گومان لێکراو تەلەفۆنیان بۆ ماڵەوە دەکرد، ڕۆژێك بۆ شت کڕین چوومە بازاڕ کامەرانم بینی بە ڕەفتاریدا وادەردەکەوت کە بە بینینی من سەرسام نەبوو، هەستم کرد دەمێکە چاودێریم دەکات، بە بینینی یەکسەر یادگارییەکانی پێشووم بیرهاتەوە، بەڵام خۆم بێ ئاگاکردو بە لایدا تێپەڕیم، بەڵام ئەو یەکسەر بەدوامدا هاتو وتی: بە باوکتم وتبوو کە قەڵەم بەسەر داواکارەکانتا دەهێنم، جگە لەوەش ئاگاداری ئەوەشم کە مەرجەکەی باوکت تەنها لەبەر من بوو، ئێستاش پێت دەڵێم: یان لە مێردەکەت جیا دەبیتەوە، یان ئەو وێنانەی کە پێکەوە گرتومانن لە گەڕەکەکەدا بڵاوی دەکەمەوەو بەڵایەك بەسەر مێردەکەتدا دەهێنم کە هەرگیز بیری نەچێتەوە، کامەران دوای وتنی ئەم قسانە بە خێرایی دوور کەوتەوەو منی بە ماتو خەمباری بەجێ هێشت، دەمزانی ئەو مرۆڤە تەماعکارو شەڕانییە لەو جۆرە کارانە بەدوور نییە، ئەو ڕۆژە چەند سەعاتێك لە شەقامەکاندا پیاسەم کردو بیرم کردەوە، حەزم نە دەکرد ژیانم تێکبچێت ئامادەش نەبووم تا کۆتایی ژیانم لە ترسولەرزدا بژیم، هەر لەبەرئەوە زۆر بوێرانە چوم بۆ سەر کارەکەی مەهدی، بە خۆمم وت مەرگ جارێکەو شیوەنیش جارێك، یان ئەوەتا مەهدی دەم بەخشێت، یان لێم جیا دەبێتەوە، بەهەرحاڵ هەرکامیان بێت خۆ لە هەڕەشەکانی کامەران ڕزگارم دەبێت.

مەهدی بە بینینم زۆر سەری سوڕماو بە میهرەبانییەوە سەیرێکی کردم، نەم دەزانی دەبێ لە کوێوە دەست پێ بکەم، بەڵام کاتێك هاتمەوە سەر خۆم هەموو شتێکم بەڕاستی پێ گوتو چاوەکانم پڕببوو لە ئەسرین، دەمزانی بە بیستنی قسەکانم بە تەواوی نارەحەتو تورە بووە، بەڵام لەبەرئەوەی کە بەڕاستگۆیانە هەموو شتێکم پێ گوت نەیویست کاردانەوەی خراپی بەرامبەرم هەبێت.

من تەنانەت مەسەلەی ڕاکردنەکەشم پێ گوت، دوای ئەوە بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بم مەهدیم بەجێهێشتو ڕۆیشتم.

مەهدی تا سێ ڕۆژ نەهاتەوە بۆ ماڵەوەو منیش هەموو شەوێك لە ماڵەوە دەهاتمو دەچوومو دەگریام، بە هەرحاڵ ڕۆژێك نزیکی نیوەڕۆبوو کە هاتەوەو باوکیشمی لەگەڵ بوو، ئەو هەموو شتێکی بە باوکم وتبوو، لەگەڵ باوکمدا بەڕەسمی شکاتیان لە کامەران کردبوو، پۆلیسەکانیش بە یارمەتی باوکم کامەرانیان دۆزیبووەوە، کامەرانیش لە بنکەی پۆلیس دانی بەوەدا نابوو کە بووەتە هۆی بێزاریو نارەحەتی بۆ من، بە تایبەتی ئەوەش دەرکەوت کە تەلەفۆنە گومان لێکراوەکانی ئەم دواییە هەر ئەو بووە.

ئەو شەوە تا درەنگێك باوکم لە لامان میوان بوو دوای ئەوەی کە ڕۆیشت مەهدی ڕووی تێکردمو وتی:

لەوانەیە بێزارییەکانی کامەران تەواو نەبووبێت، ڕۆژێك لە ڕۆژان دیسان دەست پێ بکاتەوە، بەڵام ئێستا ئیتر خەیاڵم ئاسودەیەو دڵنیام کە هاوسەرەکەم منی هەڵبژاردووەو تا کۆتایی تەمەنیش پێش بە بێزاریو نارەحەتییەکانی هەموو کەسێکی وەکو کامەران دەگرێتو ڕێگە نادات هیچ کەسێك ژیانی خۆشمان لێ تێکبدات، هیچ پیاوێك حەز ناکات هاوسەرەکەی بە هۆی هەستیشەوە پێشینەیەکی هەبێت، بەڵام تۆ کەسێکی کە لە کاتی هەستیاریشدا توانیوتە عەقڵت بەکار بهێنیتو ئابڕووی خۆت بپارێزیتو پێ بە هەموو هەوەسو ئارەزووەکانتدا بنێیت. من بە بوونی تۆ شانازی دەکەم، چونکە هەمیشە لە دژوارترین کاتدا باشترین بڕیارت داوە!

# قۆپییکردن!

م.هۆزان جەلیل حەمە سەلیم

مرۆڤ لە سەرەتایی دەستپێکردنی ژیاندا تۆماری هزری وەك پەڕەیەکی سپی وایە، هیچ جۆرە سیفەتێکی تێدا تۆمارنەکراوە، ئەوە کاریگەری دەوروبەرە لە سەرەتای ژیاندا کام کردارو کام سیفەت لە هزری نەوەکانیاندا تۆماردەکەن، سوودبەخش، یان زیانبەخش، واتە مرۆڤەکان لە سەرەتای ژیانیاندا هەڵگری هیچ پەیامێکی نادروست نین، وەکو درۆ، ڕقوکینە، شەڕەنگێزیو فێڵ و هەموو ڕەوشتە ناپەسەندەکان تا خودی خۆییو دەوروبەرو مرۆڤایەتی پێ ئازار بدات، یەکێك لەو دیاردە ناپەسەندانە کە بەشێوەیەکی باو دەبینرێت ئەوەیە کە ناودەبرێت بە قۆپییکردن، ئەم وشەیە لە زاراوەی ئینگلیزیدا بە (Cheating) واتە گزی، یان فێڵ، یان خەڵەتاندن ناوزەند کراوە، ئەمە دیاردەیەکی ترسناکە، ڕۆژانە لەم جیهانەدا بەشێوازی جیاواز دەبینرێت، وەك فێڵکردنی دەسەڵاتدار لە ژێردەستەکانی، فەرمانبەر لە کارەکەی، فرۆشیار لە کڕیارەکانی... بەڵام ئەوەی مەبەستمە تیشکی بخەمە سەر دیاردەی فێڵکردن، یان قۆپییکردن تووشی هەندێك لە نەوەکان بووە کە ناودەبرێت بە خوێندکاران جا لە ئاستی خوێندنی بنەڕەتی تا پەیمانگاو زانکۆکان دەگرێتەوە، ئەم دیاردەیە بە چەندەها شێوە لە لایەن توێژەرانەوە پێناسە کراوە، کە بریتییە لە هەرچالاکییەکی ڕێپێنەدراو، یان نا ئاسایی کە لە تاقیکردنەوەکان ئەنجام دەدرێت لە پێناو گەیشتن بەو ئامانجەی کە مەبەستییەتی، ناکۆك لەگەڵ یاساو نەریتە کۆمەڵایەتییەکان، ڕێژەی ئەم دیاردەیە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازە، پێویستە هەڵوێستەیەك بکەینو ڕێگە نەدەینو نەهێڵین ئەم دیاردەیە، یاخود ئەم نەخۆشییە تەشەنە بکات، زۆر گرنگە بۆ هەر دیاردەیەك تێڕوانینەکانمان فرە لایەن بێت، یەك لایەن نەبینرێت، لەوانەیە هەندێك باوكو دایك خاوەنی نەوەیەك بن، ئەم نەوەیان هەڵگری ئەم سیفەتە نا دروستە بێت، تێڕوانینمان بەشێوەیەك بێت کە بە سادەو ساکارانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، وەك هەڵەیەکی گەورە تێڕوانینیان بۆی نەبێت، گرنگە بزانین ئەو نەوەیەی هەڵگری سیفەتێکی وا نادروست بێت ئێستا لە قۆناغەکانی بنەڕەتیو زانکۆکاندا بخوێنن بە فێڵو گزییەکانیان بگەنە ئامانجو ئاواتەکانیان، خۆ هەندێك لەو کەسایەتیانەیە لە دوارۆژدا ئەرکی بەرپرسیارێتی دەکەوێتە سەرشانیان، ئەگەر هەمان دیاردە لە کاری ڕۆژانەیان پیادە بکەن، کێ لە ئێمە خۆشحاڵە ژیان بە ڕێ بکات کە میری ناوچەکەی فێڵی لێ بکات؟ کێ لە ئێمە خۆشحاڵە کارەکەی لە بەردەست فەرمانبەرێك بێت فێڵی تیادا بکات؟ کێ لە ئێمە خۆشحاڵە کارێکتەری کڕیار ببینێتو فرۆشیار فێڵی لێ بکات؟ باوەڕناکەم کەس بەم کارانە بڵێ ئامین، گرنگە بزانین هەندێ لە نەوەکان دەبنە بەڕێوەبەرو فەرمانبەرو فرۆشیار... بۆیە با هەموومان هەوڵ بدەین ئەم دیاردەیە بنەبڕ بکەین، پەیامێك بدەینە نەوەکان هەڵگری ئەو پەیامە بن کە هەر شتێك بۆ خۆیان پێیان خۆش بێت بۆ هاوژینەکانیشیان بە هەمان شێوە، هەر شتێك بۆ خۆیان بزانن زەرەرمەندە بۆ بۆ هاوژینەکانیشیان بە هەمان شێوە لێی بڕوانن، تا لە کۆتایی هاوکێشەکەدا ببینە خاوەن نەوەیەك بیرکردنەوەکانیان بە ئاڕاستەیەك بێت گەیشتن بە ئاواتو ئامانجەکانیان، هەوڵو ماندووبونی دەوێت، کاتێك بە دەستی دەهێنن بزانن چەند بە نرخە، هەرزان فرۆش نەکرێت، ئەوە بە ئەرکو ماندووبوونو شەونخونییەکی زۆر بە دەست هاتووە، گەیشتن بە ئامانج بە ڕێگەی دروست بەربڵاو بوو، بە هیچ شێوەیەك جێگەی ئامانجە فێڵاوییەکان نابێتەوە تا ببینە خاوەن نیشتیمانێك فێڵو خەڵەتاندن کۆچ بکەنو ڕاستگۆییو ڕەوشتەجوانەکان جێگەی بگرنەوە، گرنگە ناخەکان بە شێوەیەك پەروەردە بکرێت هاوژین بن لەگەڵ بیرە باشو دروستەکان، نا تەبابن لەگەڵ درۆو فێڵو ناپاکیوخەڵەتاندنو... هتد.

یەکێك لە گرنگترین لایەنەکان دایکانو باوکانی بەڕێزن، بەخێوکەری

نەوەكانمانـــن، ماندوبوونیان جێگەی ڕێزە كــە دەتوانــن ڕۆڵەكانیــان بەشـێوەیەك پەروەردەبكــەن كە دیــاردەی قۆپییكردن بەشـێوەیەكی بێــزراوو نادروســت تەماشــابكەن، گرنگە پەروەردەكاران ئەوە بزانــن هیچ دایكو باوكێك شــادمان نییە كــە نەوەكانــی ئــەوان بــە ماندووبونو شــەونخوونی پلەكانــی خوێنــدن دەبڕن، كەســانێكیش دەگەنــە هەمان پلــەو پایە بــە فێڵو كارە نادروســتەكانیان، ئەم دوو نەوەیــە لە چ یاســایەكدا ڕەوایە بە یەك چاو تەماشا بكرێن؟!

گرنگــە نــەوەكان خاوەنــی كەســایەتییەك بــن كــە دوور بێــت لــە دیاردە نادروســتەكان، هەمیشــە ڕێگر بن لەم جــۆرە دیاردانە، گرنگــە بزانرێت لە كام خوێندكارەیــت، ئــەو خوێنــدكارەی كەســایەتییەكی دروســتی بۆ خۆی بنیات ناوەو بەهرەكانی دۆزیوەتەوەو ئاڕاســتەی بیركردنەوەكانــی دروســتەو لــە پێنــاو ڕاستگۆیی و هەستكردن بە بەرپرسیارێتی دەژی، یاخــود ئەو خوێنــدكارەی هەڵگری بیرۆكەی خراپو ناپەســەندەو بێ باكانە كارەكانــی ئەنجام دەداتو بۆ گەیشــتن بە ئامانجەكانــی یەك لایەنە بیــر دەكاتەوە، لایەنەكانی تر فەرامــۆش دەكات، پەنا بۆ فێڵكردنو خەڵەتاندن دەبات.

مامۆســتایانو پــەروەردەكاران ماندوبوونیان بــەرز دەنرخێنرێت، بەڵام یەكێكــن لە لایەنەكانی دیكــە، كە گرنگە نــەوەكان ئاشــنا بكەن كە ئــەم دیاردەیە چەنــد قێزەونەو چەنــدە زەرەرمەندە بۆ كەسایەتیان؟ سزاكانی ئەم دیاردەیە چییە لە ڕووی یاساییەوە؟

ڕاگەیاندنــەكان لە ڕێگــەی دراماو شانۆگەرییەوە ئەم دیاردە ناپەساندانە بە نەوەكان ئاشنا بكرێت كە چ كاریگەرییەكی هەیە لەســەر كەســێتیان؟ زۆرجار دەبنە قوربانــی كارە فێڵاوییەكانیــان بــۆ هەتا هەتایە دەبێت باجی كارە ناپەسەندەكانیان بدەن.

ئەو بڕوانامانەی بە هەوڵو تێكۆشانو ماندوبــوونو كۆڵنــەدانو بەرنامەڕێــژیو شــەونخونیو ئارامگــریو بەردەوامبــوونو هەســتكردن بە هــاوكاری دایــكانو باوكان و مامۆســتایانو هاوژینەكانیــان بە دەســت هێنــراوە، تەنهــا خاوەنەكانیــان نرخەكەی دەزانن، بۆ هەتا هەتایە ســوود دەبەخشــێت بە خۆیــانو دایكانو باوكانو مامۆســتایانو هاوژینەكانیان، بە هاوكاری هەمووومان دەبینە خاوەنی نیشــتمانێك هەموو ڕەوشتە باڵاكان جێگەی ڕەوشتە ناپەسەندەكان دەگرنەوە.

# ئەمشەو تەنیا جێم مەهێڵە

یوسف واژەیی

ئازیزەكەی دڵو گیانم
ئەمشەو تەنیا جێم مەهێڵە
با خەم دڵم وێران نەكاو گیانم ژیانم لێ
تاڵ نەكا
با لەشكری تاریكستان خۆییم بەسەرا زاڵ
نەكا
با گێژەڵووكەی غەریبی گێژم نەكاو
ڕەشەبای ئەم بیابانە خەیاڵاتم جەنجاڵ
نەكا
جێم مەهێڵە...
ئازیزەكەم
مەڕۆ چونكە بە دووری تۆ
شەوگارم تاریكتر ئەبێو
ڕێگەی بەرەو ئاسۆ چوونم
تووڵانیو باریكتر ئەبێ.
تەنیایی تێكم ئەشكێنێو ڕەنگو ڕەگم
دەرئەهێنێ
نازانی بەم شەوەزەنگە دڵم تەنگەو سەرم
زەنگەو سینەم جەنگەڵی پڕجەنگە؟
جێم مەهێڵە
بۆچی بە شەویش بێداربم، چما لە
خەویش بێزاربم؟
مەڕوانەرە ڕەشی چاوم لەگەڵ ڕەشی
ڕانەهاتووم
هەرچەندە لێوم بە بارە بە پەژارە
بارنەهاتووم
لەگەڵم بە
تەنیا ترپەی پێییەكانت هاودەنگم بێت
خۆشحاڵ ئەبم
بەس هەناسەتم گوێ لێبێ
بەسەرنامۆییو دڵتەنگیدا زاڵ ئەبم
مەڕۆ گەر لێشم دڵگیربی لێم زیزو تووڕەو
زویربی
بەم شێوەیەش بی ئەتوانی لانكەی
سینەكەم ڕاژەنیو
گڕووی كۆرپەی دڵم ژیركەی
بە دەسرازەی ئەوینی خۆت ئەم ساوایەم بۆ
زنجیركەی
چونكە هەرچۆن بی لەگەڵم، بێ تۆییم
پژانی ژانەو زیانی گیانەو هەر بە
یەكجاری نەمانە
ئەمشەو تەنیا جێم مەهێڵە
دەبا غوربەت سڕم نەكا
بابێ تۆیی وڕم نەكا
ئەوەندە پەڕەی جگەرم ڕەش نەكا داخ
بائەوەندەش
لەدەردو ژان بێزار نەبم
بانەڵێم ئاخ لە دەستی ئاخ
خۆشەویستم
بە بێكەسیم مەسپێرە
بە تەنیا داممەنێ لێرە
با بەس جامی دڵم بكوڵێو
ژانی دووریو دابڕانی لێهەڵقوڵێو
بە دەریای بێبنو پایانی خەمداچم.
ئەوەكو گڕی هەناسەم
ئەم دارستانو جەنگەڵەی دەوروبەرم
بسووتێنێو
خۆشم تیاچم...

ئا: نێرگز ئەحمەد

# ماسولکەکانی خۆت ڕەق مەکە

هەندێجار مرۆڤ باوەڕبوون بە خۆی لە دەست دەدات. لە کاتێکدا ئەمە کۆمەڵگەیەکی بنەڕەتی مرۆڤەو خۆیشی ئاگاداری ئەم لەدەستچوونەیە. بۆیە دەبێت ئەوە بزانین تۆ نابیتە ئەو کەسەی کە بتوانیت خەڵکی بەڕێوە ببەیت، لە کاتێکدا خۆت پێویستت بەوە هەبێت خۆت بەڕێوەی ببەیت. ئەمەشت پێ ناکرێت.. مەگەر خۆت ژینی خۆت بەڕێوە ببەیت. هەر لەبەرئەوەیە ڕێگە بە خۆت مەدە ماسولکەکانت ڕەق ببن بێ هیچ سوود وەرگرتنێك. هەمیشە هەموو جموجووڵەکانت بخەرە ژێر چاودێرییەوە. هەر دوو دەستو ماسولکەکانت، شلو نەرم بکە، ماسولکەکانت ڕەقو جیڕ مەکەرەوە لە هەڵگرتنی کیلۆگرامێکدا کە وا هەست بکەیت سەد کیلۆگرامت هەڵگرتووە، چونکە بە ڕاستی شڵەژانو ئاڵۆزیو ناجێگیری دەروونی بەردەوام، لەگەڵ جیهانی ناوەوەدا کە ئاشتیو تەبایيو ئاسوودەییە، خۆی بۆ خۆی نهێنی تەندروستی مرۆڤو تەمەندرێژییەتی.. بێگومان لە هەمان کاتدا نهێنی جوانیو تەواو کامڵی مرۆڤە...

خوێنەری ئازیز، مرۆڤە دیارو نەمرەکان، ئەوانەی سەدان ساڵە ئەم دنیایەیان جێهێشتووە، بەڵام بەرهەمو زانستو زانیارییەکانیان، لە لای ئێمە سەدە بە سەدە بە نەمری ماونەتەوەو هەمیشە سوودیان لێ وەردەگرین.

* لێرەدا بە گرنگی دەزانم بە کورتیو پوختی، چەند هۆکارێکی تووڕەبوون بخەمەڕوو.. بێگومان لای هەمووان ئاشکرایە.. مرۆڤ تووشی گرژبوون و خاوبوونەوە دەبێت. ئەمەش لە لایەن ماسولکەکانەوە تووشی هەڵچوونی دەروونی دەبێتەوە.. بەڵام ئەم گۆڕانانە، لە ناوچەیەك، یا وڵاتێکدا لەگەڵ پیشەو وڵاتێکی دیکەدا جیاوازە. لە کۆمەڵگەکانیشدا لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی دیکە جیاوازە. بۆیە ئەم چەند خاڵە دەخەینەڕوو:

**خاڵەکانی تووڕەبوون**

* تووڕەبوون لە ناو ئۆتۆمبێلدا:

شۆفێرەکان لە ماتۆڕسوارەکان تووڕە دەبن. ئەوانەی بە شێوەیەکی نایاسایی دەپەڕنەوە. بە هەمان شێوە خەڵکی لە شۆفێرو شۆفێر لە خەڵکی تووڕە دەبن.. کە دەبێتە هۆی دواکەوتن بۆ سەرکارو شوێنی مەبەستیان.

* تووڕەبوون لە یارییەکاندا.

لەوانە تۆپی پێ، تێنس، مەلەکردن.. بە جۆرێك خەڵکی لە دژی یەکدی هاندەدەنو تووڕە دەبن. ئەمەش بە هۆی ڕەچاونەکردنی خاڵە یاساییەکانەوەیە، تا کار دەگاتە شەڕوپێکدادان.

* خاڵێکی دیکە بێبەڵێنی خەڵکییە لەگەڵ دەوروبەرو بەرامبەری خۆی، گەر تۆش چاوەڕوانی ئەوە دەکەیت، خشتەی کاتەکانی خۆت لەسەر خشتەی کاتەکانی خەڵکی ڕێکبخەیت.. ئەوا دڵنیابە ئەو کات بە دوو چاو نابینیتو بە خۆت دەڵێیت: من مافی خۆمە، تووڕە ببم.. چونکە ئەوە دوو کاژێرە منی لە چاوەڕوانیدا ڕاگرتووە.

* لەوانەیە دوابەدوای هەر قۆناغێکی تووڕەبوونو ڕەفتارێکی توندوتیژ، بە خۆت بڵێیت: بەزەییت بجووڵێتو بەزەییت بە خۆتدا بێتەوە.

خەم بۆ خۆتو ئەم بخۆیت.. پاشان کەسیش نییە وەکێ پێکات دوای ئەم پەشیمان بوونەوەت.

* بە تووڕەیی ناتوانیت بە شێوەیەکی ڕوونو ئاشکرا، بیر بکەیتەوە.. بۆیە دەتەوێت لە ڕۆشنبیری بێبەری بیت. ئیدی بۆ درگی ئەو خاڵە لاوازو دزێوانە ناکەیت، لەوانەیە بە خۆت بڵێیت: مرۆڤ هەڵگری تووڕەبوونە. ئەم بیانووە بۆ خۆت داتاشیو بڵێیت: "مرۆڤ پێویستی بە تووڕەبوونە".

* کاتێکیش باسی هۆکارێکی سستیو لاوازی تووڕەییمان بۆ کردن.. دەمەوێت بە کورتی تیشك بخەینە سەر ئەم لایەنە:

* ئەوانەی دڵخۆشن تووڕە نابن:

ئەوانە ئەو کەسانەن چەند تایبەتمەندییەکیان لە بیرو کردارو ئاکاری خۆیاندا سەپاندووە.. ئەو کەسانەی

# دایك چۆن دەبێتە سەرچاوەی زیرەکی منداڵەکەی

بەشی دووەمو کۆتایی

و/ عوسمان حاجی سەلام

له هیچ ڕوویەکەوە خۆیان خەریك ناکەن بـە دادگەرییەوە. کاتێـك ببینن خاوەنی دەسـکەوتێکی مەزنن، بە مافی سـەرەکی ئەو کەسـەی دەزانن‌و دڵخۆش دەبن.. بیر لەوە ناکەنەوە که هەموو کەسێك له ڕووی داراییـەوە یەکسـان بێت.. نـە گلەیی له کـەس دەکەن، نه ڕەخنە له کەس دەگرن‌و نه بەخراپی باروگوزەرانی کەسانی دیکەش خۆشـحاڵ دەبـن. هێندە سـەرقاڵی کاری خۆیانن، بە جۆرێك نازانن دراوسـێکانیان خەریکی چین. ئەوانە باشترین کەسن که خۆیان خـۆش دەوێتو لـە دەرفەتەکاندا گرنگی بە پێشکەوتنی خۆیان دەدەن.

* تووڕەبوون له ڕووداوو کارەسـاتێك که له سەروو دەسەڵاتی تۆوەیه.. لەوانەیه سیاسەت، پەیوەندی دەرەکی، یان ئابووری به دڵی تۆ نەبێت.. بەڵام خودی تووڕەبوون نابێت بە گۆڕانکاریی هیچ شتێك.

ئـەم چەنـد خاڵـە چەنـد هۆکارێکی زۆر کەمبـوون له تووڕەبوون که مشـتێکی خەرمانێکـە.. بەڵام ئێمەی مـرۆڤ نابێت ئەوەمان له بیر بچێت که هیچ تووڕەبوونێك، ناتوانێـت یاسـای هیچ وڵاتێـك بگۆڕێت.. بێگومان یاسـاش بـە دڵی هەمـوو لایەك نییه.. بۆیە تووڕە دەبین. ئەمەش ئەنجامی بێدەسـەڵاتییە.. بۆیە گوتراوە: ئارامگرتن تاڵە، بەڵام بەرهەمەکەی شیرینە.

* ئەنجـامو بەهرەمەنـدی لـە هەڵبژاردنی توڕەییدا:

- هـەر کاتێـك بـە هـۆی گرفـتو ئاستەنگـو سەختییەکەوە، تووشی تەنگژەو قەیرانێك بوویت.. هەسـت بە بێهیوایی‌و شـەکەتی‌و داڕمان دەکەیت. دەکرێت ڤین‌و توڕەییت هەڵنەڕێژیت. لەم بارەدا له بری ئـەوەی بەسـەر هەسـتەکانتدا زاڵ بیت.. ڤین‌و تووڕەیی دەبێت بە جێگرەوەیان.

- توڕەیـی دەتوانێـت بیانوویەکـی ناڕاسـتەوخۆ بێت بـەوەی کە دەڵێن: چی بکەم ناتوانم بێدەنگ بم. بە دەستی خۆم نییە. بەمجۆرە ئەم ئاکارە ناژیرانەی خۆت بە ئاکارێکی ژیرانەی دەزانیت.

- لە کاتی تووڕەبووندا کارێك بۆ خۆت نادۆزیتەوە.. بۆیە خولەکی سـاتەکانت له کاری بێسـەروبەرەدا بـە فیـڕۆ دەدەیت. ئەوەی دەبێتە هۆی تووڕەبوون، پێشکەوتن لێـی دوورە پەرێـز دەبێـت. بەهرەمەند دەبـن‌و بەزەییان بە خۆیانـدا نایەتەوە.. ڕق‌و ڤینیـان لەگەڵ خۆیاندا نییه. ئەگەر لێییـان بپرسـیت: ئایـا تۆ خـۆت خۆش دەوێت؟ له وەڵامـدا دەڵێن: هەڵبەت خۆم خـۆش دەوێت.. هەمـوو ڕۆژێکی نوێ، بە ڕۆژێکی شادیبەخش دەزانن.

ژماردن له بەردەمیدا:

هەموو شـتێك به دەنگێکـی بەرز له بەردەمیدا بژمێرە، پرسیاری لێ بکه چەند یاری هەیه؟ پەنجەکانی دەسـتی ژمارەیان چەندە؟ ساڵێك چەند مانگە؟ پاشان ئەوە بـە دی دەکەیـت کـە لەبەرکردنـی ئەم زانیاریانە هانی دووبارە کردنەوەی دەدەن، ئەمەش دەبێتە هۆی گەشەکردنی زیاتری زیرەکی منداڵ.

کتێب.. هاوڕێی ئەمڕۆو سبەینێ:

هەمووومان سودی خوێندنەوە دەزانین بە نیسبەت منداڵیشەوە خوێندن وادەکات پەیوەست بێت بە کتێبو دەنگی بە سۆزی خۆتەوە، هەروەها هاندەریشـی دەبێت له داهاتووشدا پابەند بێت پێیەوە، باشتر وایه لـە کاتی خوێندنـەوەی چیرۆکێکدا ناوی منداڵەکە بخەیتە شوێن ناوی ئەو کەسەی ڕۆڵی چیرۆکەکە دەگێڕێت، بەمەش زیاتر چێژ له چیرۆکەکە دەبینێت، زیاتر گەشە بە داهێنان‌و بیرکردنەوەی دەدەن.

ڕێنمایـی بۆ منداڵانی کەم توانا سـێ ساڵ بەرەو سەر:

- یاسای وێنە:

هەمـوو وێنەکانـی خێزانەکەتـان له ئەلبومێکـدا کۆبکەرەوە، پاشـان پیشـانی منداڵەکـەی بـدە بـا سـەیریان بـکاتو بیانناسێتەوە له کاتێکدا ئەگەر کەسێك له ئەندامانی خێزان لـە ڕێگەی تەلەفۆنەوە قسـەی لەگەڵ منداڵەکـەدا کرد لەو کاتەدا وێنەی ئەو کەسـەی قسەی لەگەڵدا دەکات پێشـانی بـدە بۆئەوەی یارمەتـی بدەیتو بتوانێـت پەیوەندی نێوان وێنەو ڕەنگ بە یەك بگەیەنێـت، هەروەها دەتوانی وێنەی ئاژەڵـە ماڵییەکانـی دەوروبـەرت بگریتو داوای لێبکەیـت ناوەکانیـان لەبەر بکاتو تایبەتمەندیەکانیـان بزانێـت، زیانیشـی نییه گەر تۆ لاسـای دەنگـی ئاژەڵەکانی بۆ بکەیتەوە، چونکه ئامانجی تۆ گەشەپێدانی ژیری منداڵەکەتە، بـەڵام دەبێت وریابیت له چۆنییەتی لاسـاییکردنەوەی ئاژەڵەکان بە دەنگێکی لەسـەرخۆ کـە نەبێتە هۆی ترسـاندنی، وێڕای گەشـەکردنی زیرەکی دەبێتە هۆی ڕەواندنەوەی ترس لای منداڵ، دانانی دوو وێنەی هاوشـێوە لەبەردەمیداو داوای دۆزینـەوەی ئـەو جیاوازیەی لێبکە کـە له نێوان وێنەکانـدا هەیه ئەم کارەش توانـای تەرکیزکـردن‌و وردبوونەوەی زیاد دەکات.

- کاتی نووستن:

پێـش نووسـتن لـە باوەشـی بگرەو کەمێك له تەنیشـتی دابنیشـە پرسیاری لێ بکە دەربارەی ڕووداوە خۆشەکانی ئەو ڕۆژەی، تەنانەت ناخۆشەکانیش، هەروەها هۆکاری ژماردنی بۆ ڕوونبکەرەوە بۆئەوەی هەست بکات تۆ تادواساتەکانی ڕۆژ بایەخی پێدەدەیت.

- بۆ دەرەوەی ماڵ:

لـە ماڵەوە بەجێـی مەهێڵە بۆئەوەی هەسـت بە بێزاری‌و گۆشـەگیری نەکات، بۆیـە لەگەڵ خۆتدا بیبە دەرەوە تەنانەت بـۆ سـۆپەرمارکێتیش، چونکـە بینینی ڕووخساری نەناسـراوی هاوڵاتیان دەبێتە هۆی ئاسـوودەیی منداڵ گـەر بۆ کاتێکی کەمیش بێت، کورتە باسێکی ئەو شتانەی بۆ بکە کـە منداڵەکە لە ڕێگادا بەرچاوی دەکەوێت، چونکـە لەو کاتانەدا منداڵ له ڕووی دەروونییەوە لە حاڵەتێکی وەهادایە بە ئاسـانی بتوانێـت زانیارییەکان لەبەر بکات داواشـی لێبکـە هەوڵبـدات ڕەنگی شتەکانی دەوروبەر لەبەر بکات. بۆئەوەی جارێکی تر بیانناسێتەوە بۆنموونە ڕەنگی میوەکان، یان ئۆتۆمبێل، یان جل‌وبەرگەکان وەك (کراسـی زەرد، سێوی سوور، ئاسمانی شین، گەڵاو سەوزو... هتد).

# منداڵ و ترس

و/ کاروان ڕەشید محی الدین

ترس: حاڵەتێکی سروشتیو ئاساییە کە بریتییە لە هەڵچوونێکی کاتیو دووچاری هەموو مرۆڤێك دەبێتەوە بەبێ جیاوازی، ئەمەش پەرچە کرداری مرۆڤەکانە دەیخەنە کار لە پێناو خۆ پاراستنو مانەوەدا.

ترس لە لای منداڵ جیاوازە، هەر لەبەرئەوەشە کە دایکانو باوکان نیگەرانی دەردەبڕن لە کاتێکدا هەست دەکەن منداڵەکانیان دووچاری ترس هاتوون، لەبەرئەوە بە شێوەیەکی سروشتی دایکانو باوکان حەز دەکەن منداڵەکانیان دووچاری ترس نەبن، هەتا لە پاشەڕۆژدا کەسانێك دەربچن کە متمانەیان بە خۆیان هەبێت، کاتێك کە دایكو باوك هەست بە ترسێك دەکەن لە لای منداڵەکانیان زۆر نیگەران دەبنو بەخۆشحاڵییەوە بە شوێن چارەسەرەکەیدا دەگەڕێن، منداڵ لە چەند هەڵوێستو بارودۆخێکدا دووچاری ترس دەبێتو لە لای منداڵ ترس دابەش دەبێت بۆ دوو بەش:

یەکەم: ئەو ترسە حاڵەتێکی زۆر ئاساییە، کە ئەمەش زیاتر بۆ درێژەدان بە ژیانو پارێزگاریکردن لە گیانی خۆی منداڵ پەنای بۆ دەبات، وەك ترسان لە تاریکایی، یان ترسان لە ئاژەڵو ئاو... هتد.

دووەم: ئەو ترسە لە لای منداڵ پەیوەندی بەو کەسانەوە هەیە کە منداڵەکە پەروەردە دەکەن، لە دایكو باوكو مامۆستا..هتد. واتە: هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە کاریگەرییان لەسەر منداڵەکە هەیە بەشێوەیەکی گشتی، وەك هەستکردنی منداڵ بە تاوانباری، ئەمە لە کاتێکدا کە تاوان ئەنجام دەدات، منداڵەکە هەست بەوە دەکات کە پەروەردەکارەکەی بەو کردارە ڕازی نییە، ئەم ترسە لەمەوە سەرچاوە دەگرێت.

پێویستە ئاماژە بەوەش بدەین خۆی لە خۆیدا هەبوونی ترس لە هەندێك جاردا پێویستە، چونکە جۆرێك لە وریایی دەداتە ئەو کەسە، بۆ نموونە دروستبوونی ترس لە لای قوتابی وای لێ دەکات کە کۆشش بکاتو لەگەڵ وانەکانیدا خۆی ماندوو بکات، هەرچەندە ئێستا لە ژێر ڕۆشنایی‌و بڕیارەکانی وەزارەتی پەروەردەو پرۆگرامی نوێی خوێندندا ترس بە هەموو جۆرەکانییەوە ڕێ پێ نەدراوەو قەدەغە کراوە، کە ئەمە هەنگاوێکی زۆر گەورەیەو بوێرانە بوو، کە وەزارەتی پەروەردە پێی هەستا، بەڵام پێویستە وەزارەت کار لەسەر ئەوە بکات کە لە قوتابخانەکاندا بەدیلێك بۆ نەمانی لێدانو توندو تیژی بگرنە بەر، چونکە ئەوەی لە لای هەمووان ڕوونو ئاشکرایە توندوتیژی لە قوتابخانەکانی وڵاتی ئێمەدا مێژوویەكو ڕەگو ڕیشەیەکیان هەیە، کلتوری لێدانو دارکاریو زەبرو زەنگو ئەشکەنجەی دەروونیو جەستەی قوتابی لە وڵاتی ئێمەدا مێژوویەکی هەیە!! ئیتر با ئەو هەموو کارەساتە تراژیدیایە بووەستن کە بە درێژایی مێژوو بەسەر گەلەکەماندا هاتوون، کە ئەمانیش کاریگەری زۆریان هەیە لەسەر دروستبوونی ترس.

لەبەرئەوە پێویستە وەزارەتی پەروەردە بە بەردەوامیو بەبێ دابڕان خول بۆ مامۆستایان بکاتەوە، خولێك کە بتوانێت زانستی نوێ بداتە مامۆستایان، چونکە من دڵنیام ئەگەر مامۆستا ئەوەندە زانستو زانیاری پێ بوو بۆ تێگەیاندنی قوتابییەکە، دڵنیام هیچ مامۆستایەك پێویستی بەوە نابێت بە لێدانو توندوتیژیو قسەی نابەجێ لەگەڵ قوتابییاندا بجووڵێتەوە.

هەروەك هەندێجار ترس قوتابی وا لێ دەکات کە بەردەوام لە هەوڵدانو کۆششدا

بێت تا لە وانەکانی دا شکست نەهێنێتو سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، ئیتر لێرەوە ڕۆڵو کاریگەری پەروەردەکار زۆر گرنگە لە ڕووی هاندانی قوتابییەکانیان بۆ کۆششکردن لە وانەکانداو بڕینی قۆناغەکانی خوێندن بە سەرکەوتوویی.

هەروەك لە توێژینەوەکاندا دەرکەوتووە کە ترس لە لای قوتابیانی کچ زیاترە لە ڕەگەزی بەرامبەر، کە ئەم ترسەش زیاتر لە تەمەنی سێ ساڵییەوە دەست پێ دەکات، ئەگەر لە پێش ئەم تەمەنەدا منداڵ چاوی بە مارێك بکەوێت ئەوا بەبێ ترس یاری لەگەڵ مارەکەدا دەکاتو هەوڵ دەدات دەستی لێ بدات، لەگەڵ ئەوەی منداڵ تەمەنی بەرەو گەورە بوون دەڕوات ئیتر ماناو واتای ترس دەزانێت، کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ زیاد بوونی ئەزموونی منداڵەکە، پێویستە ئەوەش بزانین کە زۆربەی ئەو مەترسییانەی لە لای منداڵ دروست دەبن، حاڵەتێکی نا بابەتیو ناوخۆییەو پەیوەندی بە ئەندێشەو خەیاڵەوە هەیە، هەرکات خەیاڵو ئەندێشە لە لای منداڵ زۆر بوو زیاتر هەست بە ترس دەکات، لەبەرئەوە لەسەر دایکانو باوکان پێویستە کە هەوڵ بدەن بۆ دوورخستنەوەی منداڵەکانیان لەو ئەندێشەو خەیاڵانەی کە دوورن لە ڕاستییەوە، منداڵەکانیان تێ بگەیەنن لەوەی کە جیاوازی هەیە لە نێوان واقیعو خەیاڵدا.

هەندێك لە دایكو باوکان هەڵەیەکی زۆر گەورە بەرامبەر منداڵەکانیان ئەنجام دەدەن، ئەویش ئەوەیە کە بە شانازییەوە ترساندن وەك فشارێك بەکار دەهێنن لە بەرامبەر منداڵەکانیاندا هەتاوەکو بەگوێیان بکەن! وەکو دەڵێن: شیرینی مەخۆ نەخۆش دەکەویت، بەلام منداڵە زیرەكو وریاکان هەر زوو نهێنی ئەم جۆرە بانگەشانە ئاشکرا دەکەن! ئیتر لێرەوە کێشەیەکی زۆر گەورە سەر هەڵدەدات ئەویش ئەوەیە کە منداڵ متمانەی بە دایكو باوکی نامێنێت!

ئەوەشی کە زۆر قورس و نەگونجاوە جیاوازیو جیا کردنەوەیە لە نێوان ترسو تۆڵەدا لە پەروەردەکردنی منداڵدا، سزادانی منداڵ لە بەرامبەر هەر سەرپێچییەکدا دەبێت سزادانەکە نەگاتە ئەو ئاستەی کە ببێتە هۆی تۆقاندنی منداڵەکە، بە پێچەوانەشەوە نابێت سزادانەکە هێندە کەم بێت، کە منداڵەکە بەبێ بایەخ سەیری بکات، واتە بە شێوەیەکی گشتی دەبێت سزادانەکە مامناوەند بێتو توانای ئەوەی هەبێت کە منداڵەکە بەهێز بکاتو بەرەو ڕەوشتو خووە کۆمەڵایەتییە پەسەندەکان ئاراستەی بکەن، بەبێ ئەوەی سزادانەکە ببێتە هۆی ئەوەی متمانە لە منداڵەکە بسەنێتەوەو نائومێدی بکات، بە هۆی ترساندنەوە بێت، یان لە گرنگی پێ نەدانی منداڵەکەوە بێت، ئەویش لە ڕوانگەیەکەوە کە دایكو باوك زۆرجار لە دڵنیا بوونی خۆیانو گومان باشییان بەرامبەر منداڵەکانیان گرنگی نادەن بە پەروەردەکردنیانو پاشان هەست دەکەن منداڵەکانیان بەو شێوەیە نەبووە، بەپێچەوانەی گومانە باشەکانی خۆیانەوە بووە.

### چارەسەر:

ئەگەر دەتەوێت بەسەر ترسی منداڵەکەتدا زاڵ بیت، ئەوا پێویستە واز لە منداڵەکەت بهێنی لە کاتێکدا کە هەست بەوە دەکەیت کە منداڵەکە دووچاری ترسو تۆقاندن دەبێتەوە، لێی گەڕێ با بە ئازادیو بێ ترس گوزارشت لە دەروونی خۆی بکات، پاشان بە هێمنییەوە ئەوەی دەتەوێت بەشێنەیی لە منداڵەکەی بگەیەنە، لێرەدا دووجار سوودمەند دەبیت، هەم منداڵەکە بە گوێت دەکات، لە هەمان کاتیشدا منداڵەکە لە تۆقاندن دوور دەخەیتەوە.

دایکانو باوکان دەتوانن خۆیان لە ترساندنی منداڵەکانیان بپارێزن لە کاتی پەروەردەکردنیاندا، ئەویش لە ڕێی گرتنەبەری هۆکارەکانی پەروەردەی دروستەوە، ئەویش بە ئاراستەکردنی منداڵەکانیان بە سۆزو خۆشەویستیو لەسەرخۆ، دوور لە گیانی هەڵچوونو تۆقاندنو هەڵسوکەوتی دڵڕەقانەو سەرزەنشتکردن، کە ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانە هۆکارێکی سەرەکین تا منداڵ متمانەی خۆی لە دەست بداتو لە ژیانی ڕۆژانەدا دووچاری نائومێدیو ڕەشبینی ببێت.

لە کۆتاییدا پێویستە ئاماژە بەوە بدەم کە منداڵ لەگەڵ گەورەبوونیدا بە شێنەیی ئەو ترسە ئاساییەی نامێنێت، کە پێشتر ئاماژەمان پێدا، بەڵام ئەگەر ئەو ترسە گەیشتە ڕادەی تۆقاندنو بە ئاشکرا لە منداڵەکە بەدی کرا، ئەوا ئەو ترسە لە منداڵەکە دەبێتە نەخۆشی، واتە ترسەکە لێرەدا لە حاڵەتێکی ئاساییەوە دەبێتە نەخۆشی، ئیتر لەم حاڵەتەدا پێویست بەوە دەکات کە دەستبەجێ منداڵەکە بگەیەننە لای پزیشكو پسپۆڕە تایبەتییەکان هەتا بتوانن چارەسەری گونجاویان بۆ بدۆزنەوەو هاوکارییان بکەن.

سەرچاوە: ئینتەرنێت.

سڵاو... بە ڕۆحێك کە وەك ئاسمان شین بێتو وەك دەریا پاكو زوڵاڵ...

سڵاو.. بە دەستانێك کە پاڵپشتو پەنای هەمیشەیین...

سڵاو... بە چاوانێك کە ماقوڵترینو گەورەترینی چاوانی دنیان...

سڵاوی من لە تۆ.. ئەی ئاستانەی بەزەییو ئەی سەرپەنای خۆشەویستیو ئەی ترۆپکی سۆز..

سڵاوی من بۆ تۆ ئەی دایەگیان!

تەنها دەتوانین عەشق لە دەستە میهرەبانەکانی تۆدا بدۆزینەوە.. خەزانی نیگاکانی من، لە خەزانی نیگاکانی تۆدا جێگیر دەبن. تۆ تەواوی ساتەکانی تەژێ، لە شەوقی ژیانی منیت.. ناوی ژیانی تۆ، پاکترین وشەی جیهانە ئەی دایەگیان.

بێ تۆ بوون، واتە تەنهاییو ساتەکانی بێ تۆیی، سیخناخن لە تەنهایی. من شەوانە بێ تۆ، لە ماسییە سوورەکەی حەوزی دراوسێکەمان، تەنیا ترم. خۆزگە پێش ڕۆیشتنت، ئەزموونی تاڵیو سوێریو ساردیی بێ دایکییت بۆ من باس بکردایە.. لەوانەبوو قەدری ساتەکانی بێ تۆییم بزانیبایە. من بێ تۆ، لانەکەم پڕپڕە لە بۆنی عەتری تۆ.. ئەی دایکە کۆچکردووەکەم.

سەرچاوە/ روزهای زندگی.

# پێویستت بە بەرد هەیە؟

ئا/ بەرزان ئەبوبەکر

بازرگانێك بە سواری ئۆتۆمبێلە نوێیەکەی کە لە جۆری (جاکوار) بوو، بە نێو یەکێك لە شەقامەکاندا بە دڵێکی خۆشەوە بەرەو نووسینگەی کارەکەی دەڕۆیشت، لە ناکاو ئۆتۆمبێلە نوێیەکە کە چەند ڕۆژێك بوو کڕیبووی، بە بەردێکی گەورە لە لای ڕاستی شەقامەکەوە پێکرا!

بازرگانەکە بە خێرایی لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزی تا بزانێت کێ بوو ئەو بەردەی گرتە ئۆتۆمبێلەکەیو سەیری ئەو زیانەش بکات کە بەر ئۆتۆمبێلەکەی کەوتووە...

لەو کاتەدا منداڵێکی بینی لە سووچێکی شەقامەکەدا وەستابوو، کە بە ڕووخسارییەوە نیشانەی ترسو دڵەڕاوکێ دیار بوو..

بازرگانەکە لە کاتێکدا پەستیو توڕەیی نێوچەوانی تاریك کردبوو، لە منداڵەکە نزیك بوویەوە...

یەخەی منداڵە بێچارەکەی گرتو بە دیوارەکەوە نووساندیو زۆر بە توڕەیی پێی گوت، نەزان بۆچی ئەو کارەت کرد، بۆ ئۆتۆمبێلەکەت لەکەدار کردم، بۆ ئەو بەردەت گرتە ئۆتۆمبێلەکەم؟

دەزانیت بەم کارەت دەبێت هەموو سەروەتی خۆشتو باوکیشت بدەیت بۆ پڕکردنەوەی ئەو زیانەی بەر ئۆتۆمبێلەکەم کەوتووە...

لەو کاتەدا هۆن هۆن فرمێسك لە چاوی منداڵەکە دەهاتە خوارەوە، بە قوڕگێکی پڕ لە گریانو بە چاوی لە ئەسرینو بە دەنگێکی کزۆڵو خەمبارەوە بە بازرگانەکەی گوت: (زۆر بە داخەوەم، بۆ ئەو ڕووداوە، بمبورە...)!

لە ڕاستیدا من نەمدەزانی چ کارێك بکەم، لە بەیانی زووەوە لەم شوێنەدا وەستاوم، چاوەڕێم کەسێك ئاوڕم لێبداتەوەو لایەکم لێ بکاتەوە، بەڵام هیچ کەس وەڵامی نەدامەوە، تەنها کەسێك بە دەممەوە نەهات.. پاشان لەگەڵ هەڵوەرینی فرمێسکەکانی ئاماژەی بۆ ئەوبەری شەقامەکە کرد، کوڕێك لە سەر زەوییەکە کەوتبوو، دواتر بە دەم گریانو هەنسکەوە بەرەو لای کوڕەکە ڕۆیشتو گوتی: ئەم کوڕەی لە نێو ئەم چاڵەدا کەوتووە برامە!

ئەو ناتوانێت بە ڕێگەدا بڕوات، قاچەکانی بە تەواوی لە کار کەوتوون... لەگەڵ ئەم برایەمدا لەم ڕێگەیەوە دەڕۆیشتین، پاڵم بە کورسیەکەیەوە دەنا، لە ناکاو هاوسەنگی کورسییەکە تێکچوو، کورسییەکە لە دەستم ترازاو کەوتە ئەم چاڵەوە، منیش زۆر هەوڵمدا بەرزی بکەمەوەو بیخەمە سەر کورسییەکە، بەڵام نەمتوانی، دەستم لە زۆر ئۆتۆمبێل ڕاگرت تا یارمەتیم بدەن، بەڵام کەس نەوەستا، براکەشم لەو چاڵەدایە، ئیدی دەبوا من چیم بکردایە تا کەسێك ئاوڕم لێ بداتەوەو هاوکاریم بکات؟! تەنها ڕێگەیەك کە بە بیرمدا هات بۆ ڕزگارکردنی براکەم ئەوەبوو کە بەردێك بگرمە ئۆتۆمبێلێك تا خاوەن ئۆتۆمبێلەکە لەبەر ئۆتۆمبێلەکەی خۆی ڕابووەستێت و حاڵو گوزەرانی ئێمەش ببینێو یارمەتیم بدات بۆ دەرهێنانی براکەم!!

خاڵە گیان ئێستا ئامادەیت یارمەتیم بدەیت تا براکەم لەو چاڵە دەربهێنینەوەو بیخەینە سەر کورسییەکەی خۆی؟!

بازرگان بە بینینی ئەم ڕووداوە یەکجار خەمبار بوو، ماوەیەك بە سەرسامی ڕاوەستا، باوەشی بە منداڵەکەدا کردو داوای لێبوردنی لێکرد...

پاشان باوەشی بە منداڵە ئیفلیجەکەدا کردو لە چاڵەکەدا دەریهێناو خستییە سەر کورسییەکە، دەسڕێکی لە گیرفانیدا دەرهێناو برینەکانی بۆ پاککردەوە، کە بە هۆی کەوتنە نێو چاڵەکەوە دووچاری هاتبوو...

پاشان منداڵەکە زۆر سوپاسی بازرگانەکەی کردو لێی پرسی: ئێستا دەبێت من چی بکەم بۆ چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلەکەت؟

بازرگانەکەش وەکو کەسێکی میهرەبان دەستی بە سەریدا هێناو وەڵامی دایەوە، کوڕی شیرینم خەمبار مەبەو شتێکی ئەو تۆ نییە، ئێوە خۆش بن، ئۆتۆمبێل شایەنی باسکردن نییە...

ئەوەش کە جێگەی سەر سوڕمان بوو ئەوەبوو، کە بازرگانەکە بڕیاریدا ئۆتۆمبێلەکەی چاك نەکاتەوە، بۆئەوەی هەر کات سەیری کرد ئەو یادەوەرییەی بیر بێتەوە، هەروەها بۆئەوەش کە هیچ کەسێکی دی ناچار نەبێت بەردی تێ بگرێت تا ئاوڕی لێ بداتەوە....

لە ڕاستیدا ئێمە لە ڕۆژگارێکدا دەژین، سەرقاڵیو خەمەکان تیایدا یەکجار زۆر بووە، هەموو هەوڵی کۆکردنەوەی سەروەتو سامانین... وا گومان دەبەین تا سەروەتو سامانمان زۆر بێت، بەختەوەریمان زیاد دەبێت!

نازانین کە بەختەوەری لە زۆری سەروەتو ساماندا نییە، چەندین کەس هەیە لەم ژینەدا خاوەنی سەروەتو سامانی بێ شومارن، بەڵام خاوەنی بەختەوەری نین...

لە کۆتاییدا دەڵێین: ڕەنگە زۆر کەس هەبن پێویستیان بە ئاوڕدانەوەیەك هەبێت، بەڵام کەس ئاوڕیان لێ ناداتەوە، تکایە با چیدی پێویستت بە بەرد نەبێت بۆ ئاوڕدانەوە لە هەژارانو بێنەوایان...

# لە ساتێکدا هەموو شتێک گۆڕا

بەهمەن لەتیف فەتحوڵڵا

(ستیفن کوفی) پسپۆڕ لە بواری هونەری بەڕێوەبردن، سەرکردایەتیو پەرەپێدانی تواناکان، دەڵێت:

بەیانییەکی ڕۆژی یەکشەممە لە یەکێک لە شەمەندەفەرەکانی نیۆرکدا بووم، دانیشتووانی ناو شەمەنەفەرەکە بە هێمنی دانیشتبوون، هەندێکیان ڕۆژنامەیان دەخوێندەوە، لە کاتێکدا هەندێکی تریان لە بیرکردنەوەیەکی قوڵدابوونو هەندێکیشیان چاویان لێکنابوو تا ماندوێتیان دەربچێت، بە گشتی کەشەکە هێمنو ئارام بوو.

لە ناکاو پیاوێکو منداڵەکانی سواری شەمەنەفەرەکە بوون، هەربەگەیشتنیان منداڵەکان کردیان بە گاڵتەو گەپو بزێویو کەشە هێمنو ئارامەکەیان گۆڕی بەژاوە ژاوو دەنگەدەنگ، باوکیشیان لە تەنیشت منەوە دانیشتو چاوەکانی لێکنا، هەروەکو ئەوەی ئاگای لێ نەبێت چی لەو ناوەدا ڕوو دەدات؟!

منداڵەکان هاواریان دەکردو بۆیەکیان دەسەندەوە، شتیان لە یەکتر دەگرت، تەنانەت گۆڤارو ڕۆژنامەی خەڵکەکەشیان دەفڕاند، بەڕاستی ساتێکی پڕ لە بێزاریو نارەحەت بوو...

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا باوکەکە بەبێ دەنگی دانیشتبوو، بەبێ ئەوەی تەنها وشەی (بێدەنگ بن، یان دابنیشن)ێك بەرامبەر منداڵەکانی لەزاری بێتە دەرەوە...

بەڕاستی نەمدەتوانی باوەڕ بکەم باوکێك هەبێت هێندە خەمساردو کەمتەرخەم بێت، ئاگادار بێت منداڵەکانی کەسانی دی بێزار دەکەنو ئەمیش لە شوێنی خۆی نەجوڵێتو کارێك نەکات؟

کات تێپەڕیو بارودۆخەکە بەم شێوەیە بەردەوام بوو، ئارامم نەماو ڕووم کردە باوکەکەو پێم وت: بەڕێزم منداڵەکانت بوونەتە مایەی بێزاریو نارەحەتی بۆ زۆر کەس، بەڕاستی من سەرسامم کە تۆ ناتوانیت تۆزێك ئارامیان بکەیتەوەو ڕێگە نەدەیت لەوە زیاتر بێزارمان بکەن؟!

تۆ... تۆ... کەسێکی بێ هەستو کەمتەرخەمیت...

باوکەکە چاوەکانی هەڵهێنا، وەك بڵێیت تا هەست بە بارودۆخەکە بکات، بە هێمنیو لەسەرخۆییەوە وتی:

ڕاست دەکەیت حەق بە تۆیە... دەبوایە من کارێکم بکردایە... بەڵام ئێمە ئێستا لە نەخۆشخانە گەڕاوینەتەوە... نزیکەی کاتژمێرێك لەمەوبەر دایکی ئەم منداڵانە کۆتا هەناسەکانی ژیانی هەڵمژی... هەربۆیە منیش مێشکم کار ناکاتو توانای بیرکردنەوەم نییە... هەستیش دەکەم ئەم منداڵانەش تاساونو نازانن چۆن ڕووبەڕووی ئەم ڕاستییە تاڵە ببنەوە.

(کوفی) دەڵێت: بیر لە هەستو نەستی من بکەنەوە لەو کاتەدا؟

دەستبەجێ دڵم پڕ بوو لە ئازارو خەم بۆ ئەو پیاوە، هەستی بەزەییو دڵسۆزی بەبێ سنور لە دڵمەوە هەڵدەقوڵا!

پێم وت: خێزانت کۆچی دوایی کردووە؟ بەڕاستی بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر خەمبارم... دەتوانم یارمەتیت بدەم؟

لە ساتێکدا هەموو شتێك گۆڕا، هەموو بیرکردنەوەیەکم سەبارەت بەو پیاوە لە چەند چرکەیەکدا پێچەوانە بووەوە.

چیرۆکەکە کۆتایی هات... بەڵام با لە خۆمان بپرسین...

چەندە زوڵم لە خۆمان دەکەین، کاتێك بڕیارێکی خێراو بێ بنەما، لە ئاکامی هەڵە تێگەیشتنێك، بەسەر کەسە نزیك، یان دوورەکانماندا دەسەپێنین، بێ ئەوەی هەوڵبدەین هۆکاری ئەو هەڵوێستە نەشیاوەی بەرامبەرمان بزانین، چەندە زوڵم لە هاوڕێکانمان دەکەین...

ڕۆژێکیش هۆکارەکە دەزانینو بەرچاوممان ڕوون دەبێت، دەزانین ئەو بڕیارەی لە کاتی توڕەییدا بێ بنەما دەرمان کرد، نا دروستو نادادپەروەرانە بوو، ئازار دەچێژینو پێویستیشمان بە ئازایەتییەکی کەم وێنە دەبێت تابتوانین پەشیمان ببینەوەو داوای لێبوردن بکەین لەو گومانە خراپانەی بردوومانە.

بێگومان ئەم چیرۆکە کۆمەڵێك ڕووداوی ژیانمان بە بیر دێنێتەوە، کە لە زۆرێکیاندا ستەمکارو لە هەندێکیاندا ستەم لێکراو بووین...

بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە، هەوڵ بدەین ڕەوشتمان جوان بێتو پەلە نەکەین لە بڕیارداندا دەربارەی هەڵسوکەوتی کەسانی دەوروبەرمان.

گەر هەڵەمان کردو پەلەمان کرد، پاشان ڕوون بووەوە لەسەر هەڵەین، پەلە بکەین لە داواکردنی لێبوردنو لێخۆشبووندا.

ئەگەر ستەم لێکراو بووین، با فێری لێبوردەییو لێخۆشبوون بین... چونکە ئەوە ئازایەتی ڕاستەقینەیەو ڕەوشت جوانییە لەگەڵ کەسانی دەوروبەردا...

# سۆزبەخشین!

شێخانی

ئەدیبی گەورە عەلی تەنتاوی دەڵێت: ڕۆژێك خزمەتكارەكەم بینی، تۆزێك فاسۆلیاو برنجی كردە سەر سینییەكی مسو تۆزێك باینجانو چەند لەتەخەیارو دەنكە قەیسییەكیشی فرێدایە سەرو هەڵیگرت تا بیبات.

پێم گوت: ئەمەت بۆ كێیە؟

گوتی: بۆ پاسەوانەكەمە.. خانم فەرمانی پێكردووم، بۆی ببەم.

پێم گوت: بگەڕێوە.. چ بێ زەوقییەكە! ئەم كارەی تۆ.

ئادەی سینییەكو چوار قاپو كەوچكێكو چەقۆیەكو پەرداخێك ئاو بهێنەو هەر جۆرە خواردنێك لە قاپێكی سەربەخۆی پاكو خاوێندا دابنێ.

دوای ئەوەی، ئەوەی پێم گوت.. جێبەجێی كردو هەمووی لەسەر سینییەك دانا، هاوڕێ بە كەوچكو چەقۆو پەرداخەكە، گوتم: ئێستا بۆی ببە!!

دواتر پێم گوت: بەم كارەت هیچ زیانێكت كرد؟ ئەم ڕێكوپێكییە لە خودی خواردنەكە باشترە!

چونكە خواردنەكە بەخشینی ماڵە.. بەڵام ئەم كارە سۆزبەخشینە. یەكەمیان سك تێر دەكات.. بەڵام دووەمیان دڵ!

شێوازی یەكەم پاسەوانەكە زەلیل دەكات. وا دەكات كە هەست بكات وەك سواڵكەرێك وایەو پاشماوەی خواردنی پێ دەدەن..

بەڵام شێوازی دووەم وا دەكات كە هەست بكات، دۆستێكی ئازیز.. یا میوانێكی بەڕێزی ئێمەیە.

ئەم ئەدەبە بەرزەو ئەم زەوقە جوانە.. پێویستە هەموومان فێری ببینو بزانین كە بەخشینی سۆزو خۆشەویستی، لە هەموو جۆرەكانی بەخشین گەورەترە.

هاوكات دەبێت ئەوەش بزانین كە نابێت بە هۆی هەژاریو پێداویستییەكانی ژیانەوە.. مرۆڤایەتی مرۆڤەكانمان لەلا كاڵ ببێتەوە.

كاتێكیش دەمانەوێت یارمەتییان بدەین.. مەبەستمان سەلماندنی خودی خۆمانو چاوشۆڕكردنی بەرامبەر بێت.

هەژارانو كەمدەرامەتانیش، وەكو ئێمە مرۆڤنو زۆرجار لە نێو پۆشاكی دڕاوو پینەكراوی ئەواندا، دڵێكی گەورە و هەستێكی بەرزو كەڵەمرۆڤێكی گەورە دەژی.

زۆر بە هەڵەدا دەچین.. ئەگەر تەنها بە چاوی سەروەتو سامانەوە، لە مرۆڤەكان بڕوانین.

بۆ سارێژی برینو ناسۆرییەكانی ئەوانیش.. ئەگەر هیچمان لە توانادا نەبوو.. خەندەیەكی گەش، وتەیەكی خۆش، سڵاوێكی گەرم، دەستێكی نەرم، باوەشێكی پڕسۆز.. گەورەترین بەخشینە!!